# گەشتی ژیان

بەرگی دووەم

ئەندازیار عوسمان

٢٠١٥-١٤٣٥

# گەشتی ژیان

بسم اللّٰه الرحمان الرحیم


* ناوی پەڕاو :گەشتی ژیان

* بەرگی دووەم

* نووسەر : عوسمان محمد رەشید

* تیراژ : ۲۰۰۰ دانە

* ژمارەی سپاردن ۱۲۳۹ لە ۲۰۱٤ ب.گ. کتێبخانەکان


قەت بیرت کردۆتەوە کە بۆچی حەزرەتی یەعقوب
بە یوسف تاقی کرایەوە ؟؟؟
چونکە یوسفی لە هەمویان زیاتر خۆش دەویست
مرۆڤ بە خۆشەویست ترین شتی تاقی دەکرێتەوە
مەولانـــــا




لەهیچ شتێکی منالێم پەشیمان نیم تەنها
ئەوە نەبێت حەزم ئەکرد زوو گەورە بم..!
داناییەک
بەرەو ئامانج
BARAW AMANJ


بێ هیوا مەبە ...
رەنگە خۆر لە پەنجەرەیەکەوە
بێتە ژوورەوە تۆ بیرت
چوو بێت دایبخەی !
بەرەو ئامانج
BARAW AMANJ

## گەشتی ژیان بەکورتی

وەلیدی کوڕی تەلاڵ ٣٢ ملیار دۆلاری هەیە لەئەزموونی ژیانیە و ە بڕیاری دا کەهەمووی لەڕێی دووڕێکخراوەکەیەوە ببیەخشێ و خزمەتی مرۆڤایەتی پێبکات. ئەوەش وینەی ناو فڕۆکەکەیەتی کە بەئاڵتوون رازاوەتەوەوبایی نزیکەی نیو ملیار دۆلارە.



# گەشتی ژیان

## پێشەکی

سوپاس وستایش بۆ خوای پەروەردگاری جیهان و درورود و سەلامیش لەسەر پێشەواو مامۆستا وڕابەرمان (محمد)ﷺ ،ڕەحمەت وبەرەکەتیش داباریێ بۆ سەر گیانی یارو یاوەران و شوێنکەوتوان.

## گەشتی ژیان:

خوێندنەوە و وردبوونەوە لە ژیاننامەی کەسایەتیەکانی دونیا لە کۆن و نوێدا سوودی زۆری هەیەو،بەهۆیەوە زۆر لە ڕاستیەکانی ژیانمان بۆ دەردەکەوێت.

ئێمە هەموو دەزانین ئەجەل لەلای خوایە،بەڵام کاتێك کەسێك چەند جار ڕووبەڕوی مەرگ دەبێتەوە و نامرێت ئەو کاتە زیاتر لە دڵدا ئەچەسپێت.

ئێمە دەزانین ڕزق لەلای خوایە بەڵام کاتێك دەبینین لە ژیاننامەی کەسێکدا کە چۆن خوا ڕزقی داوە زیاتر بەرچاو ڕۆشن و دڵنیا دەبین .

ئێمە دەزانین کە ماڵی حەرام بێ بەرەکەتە وسەرەنجام بۆ چاکەکارانە ، بەلاّم کاتێك ئەوە لە ژیانی کەسێکدا دەبینین زیاتر دڵدامەزراو دەبین.

لەم زنجیرەیەدا هەوڵ ئەدەم چەند هەڵوێستێك وپوختەیەك لە ژیانی چەند کەسایەتییەك بخەمە بەردەستی خوێنەران تا ئەو سوودەی من بینیومە پشت بەخوا ئەوانیش ببینن.

# گەشتی ژیان

**سەیدەکەی صینمان :**

هەروەك چۆن لەمیسر سەیدێکمان بووە سەرقافڵەی شەهیدان و وشەکانی بۆ ئەوەی بووکەشوشەی بێگیان نەبن و گیانیان تێبێت لە پێناویانا شەهیدبوو، بەهەمان شێوەش لە صین (یوسف شەنغ کە لی ) بۆ خوا شەهیدبوو.ناوبراو ساڵی ١٩٢٣ لە دێی چانغ لە صین لەدایکبووە، لە نۆساڵیەوە ئیسلام و زمانی عەرەبی لەمزگەوتی دێیەکەیان فێربووە . پاشان لەم مزگەوت بۆ ئەو مزگەوت لای زانایانی وڵاتەکەی زیاتر شارەزابووەو ، ئنجا چووە مەدرەسەی مامۆستایان بۆ پسپۆڕی لە زمانی عەرەبیداو پاشان پەیمانگەی زانستە ئیسلامیەکانیشی تەواوکرد ولەساڵی ١٩٥٤دا بووە مامۆستای مزگەوتی شارەکەی (یەنگ چیاو) ، پاشان بوو بەمامۆستای یاریدەدەری زمانی عەرەبی لە زانکۆی پەکین ساڵی ١٩٥٥ بەهۆی مامۆستاکەیەوە (محمد مەکین ).

پاش ماوەیەکی کەم وازی لێهێنا بۆ ئەوەی دەست بەتاڵ بێت بۆ نووسین ، پاشان بوو بە مامۆستا لە پەیمانگای زانستی ئیسلامی لەساڵی ١٩٥٧ دا و، ئەوەش ساڵێکی نەخایاندو گەڕایەوە دێیەکەی خۆی و لەساڵی ١٩٥٨ ەوە نارەحەتیەکانی دەستی پێکرد لەبەندکردن و

# گەشتی ژیان

تەنگپێهەڵچنین تا نیزامی کۆمۆنیستی ساڵی ١٩٧٠لەسێدەرەی داو شەهیدی کرد.

ناوبراو بەسەید قوتبی صین بەناوبانگەو ٧١ کتێبی نووسیوە بەوتەمەنە کەمەوە کەهەمووی ٤٦ ساڵ ژیا، ٤٣ کتێبی بەهۆی کۆمۆنیستەکانەوە فەوتاون و ئەوانەی تریشی ماون ،کتێبی ناسینی ئیسلام لەرێی ناسینی محمدەوە (د.خ) چاپ کراوەو سوودی زۆری لێبینراوەو وەرگێردراوە بۆ چەند زمانێك ،شایانی باسە کتێبی تاجی وەرگێڕاوە کە سەرچاوەیەکی مەزنە بۆ فێربوونی فەرموودە .



## گەشتی ژیان

ئەم سەیدەشمان بۆ خوا ژیاو بۆ خواشەهیدبوو، سەری شۆڕنەکرد بۆ کۆمۆنیستەکان و زۆر ئازایانە لە روویاندا وەستاو سەرمەشقی موسڵمانان بوو ، نامەیەکی ئاڕاستەی سەرانی رژێم کردو هۆشیاری دانێ لە کارەساتی بیری کۆمۆنیستی و شۆڕشی بەناو رۆشنبیری ، لەسەر ئەمە گیراو ئەشکەنجەی زۆر دراو پاشان ساڵی ١٩٧٠ شەهیدکرا ، ناوبراودەیووت : **باشترە لام بە پێوە بمرم نەك بە کڕنووشەوە بژیم** !

**ئەمەریکای لوتکەی تاوان :**

**دکتۆر رافل ظافر**لەخێزانێکی سوننە لە بەغدا لەساڵی ١٩٤٨ لەدایکبووە، لەشانزە ساڵیدا بەپلەی دەیەم لەسەر هەموو عێراق سانەوی تەواوکردو چووە کۆلێژی پزیشکی وساڵی ١٩٧١ تەواوی کردو ساڵی ١٩٧٢ چووە ویلایەتی میتشیگان لەئەمریکا و لەوێش ژنی هێنا.

لەساڵی ١٩٧٣ ەوە لەبەشی طوارىء کاری دەکرد، ئەمە بێجگە لەچارەسەری دەروونی ئەوانەی تووشی ئیغتصاب دەبوون.

کاتێك بینی نەخۆشەکانی شێرپەنجە وەك پێویست گرنگیان پێنادرێت بڕیاری دا ببێتە پسپۆڕ لەو نەخۆشیەدا لەزانکۆی میتشیگان و لەساڵی ١٩٧٦ ئەوەشی تەواوکردو پرۆفیسۆر فرانسیس بۆل کە

سەرپەشتیاری بوو زۆر سەرسام بوو بەڕەوشت و لەخۆبووردوویی دکتۆر رافل و خزمەتکردنی نەخۆشەکانی .

لەساڵی ١٩٧٧ تا ١٩٧٩ بۆردی تەواوکرد لە ئەورامداو لە زانکۆی تەکساس وانەی دەوتەوە .

لەشاری ئەماریللو موسڵمانان شوێنێکیان نەبوو نوێژی تیابکەن نیوەی ماڵەکەی خۆی بۆ جیاکردنەوەو کردی بەمزگەوت بۆیان .پاشان چووبۆ شاری سیراکۆز لەنیۆیۆرك تا ببێتە بەرپرسی پەیمانگای ئەبحاسی سەرەتانی.

لەساڵی ١٩٨١دا هەرلەو شارە پارەی کۆکردەوەو مزگەوتێکی دروست کردو هەڵیان بژارد بەسەرۆکی بنکەی ئیسلامی .

لەساڵی ١٩٨٢ عیادەیەکی تایبەتی بۆ خۆی کردەوەو چارەسەری ئەو نەخۆشانەی دەکرد کە شێرپەنجەیان هەبوو وە کۆمپانیاکانی دڵنیایی هیچیان بۆ نەدەکردن و بەخۆڕایی چارەسەری دەکردن ، یەکێ لەو ئافرەتانەی کەپاش هەشت ساڵ چارەسەری کردبوو زۆر مەدحی دکتۆر دەکات و باسی بێهیوانەبوونی دەکات لەنەخۆشەکانی وهەمیشە هیوای ئەدانێ و باسی گەشتی حەجی خۆی بۆ دەکردن.

ساڵی ١٩٩١ یش کەزانی خەڵکی لە دەوروبەری ولایەتی نیۆیۆرك پێویستیان بە چارەسەرە خەستەخانەیەکی کردەوەو پزیشکی باشی بۆ پەیداکردو ساڵی ٢٠٠٠٠ نەخۆشیان چارەسەردەکرد.

## گەشتی ژیان

ساڵی ١٩٩٣ دەزگایەکی خێرخوازی دامەزراند بۆ کۆکردنەوەی هاوکاری بۆ منالأنی عێراق کە ئابلۆقەی ئابووری لەسەربوو. بەشداری کرد لەدامەزراندنی (کۆمەڵەی ئیسلامی ئەمەریکای باکور) و ،بەهەموو ویلایەتەکاندا دەگەڕا بۆ وتاردان و بانگەوازکردن ، لەم ساڵأنەی دوایشدا سێ ڕۆژ لە عیادەکەی کاری دەکردو چوار ڕۆژیش خەریکی بانگەوازکردن دەبوو.

پاش دوانزە ساڵ لە هاوکاری منالأنی عێراق و پاش خزمەتێکی بێوێنە لەبواری پزیشکیدا بۆ ئەمریکیەکان ، دوای ١١ی سێبتەمبەر بەتۆمەتی تیرۆر گرتیان وهەرچەند هیچی لەسەر ئیسپات نەبووە ٢٢ ساڵ حوکمیان دا، لە ساڵی ٢٠٠٢ داو تا ئێستا بێنازو بێتاوان ١١ ساڵی تەواوکردووە.

خەڵکی شارەکەی و دەوروبەری بەموسڵمان و غەیرە موسڵمانەوە خۆپیشاندانیان کرد بۆ بەردانی سوودی نەبوو، تەنانەت ٣٤ ئەمریکی ئەوەندە دڵنیابوون لە بێتاوانی دکتۆر دوملیۆن دۆلاریان کەفالەت بۆدا ، کەچی ئازادیان نەکردو ، ٩٠ کەسایەتی ئەمریکیش بۆی تێکۆشان بێسوودبوو .

ئەوەی سەیرە وەك دکتۆر فەیسەڵ قاسمی بەرنامەی (اتجاه معاكس) دەڵێت : یەك شیعە نابینی لە گوانتانامۆ گیرابێت یان تۆمەتی تیرۆری بخرێتە پاڵ لەکاتێکدا بەهەزارانی وەك دکتۆر رافل بەناهەق دەگیرێن و دەکوژرێن ، ئایا ئەمە جێی سەرسوڕمان نیە کەئاوا ئەمریکاو ڕۆژئاوا

## گەشتی ژیان

دژایەتی مەزهەبی سوننەبەگشتی و ئیخوان دەکەن بەتایبەتی لەسەر تاسەری دونیاداو ناوچە سونیەکان خاپووردەکەن.؟؟

بە مادلین ئۆلبرایتیان وت: چۆن دەبێت بە ئابڵوقەی ئابووری بۆ سەر ولاٚتێ نیو ملیۆن منالٚ ببنە قوربانی ، وتی: زۆر ئاساییە لەوە زیاتریش ببنە قوربانی!(حسبنا الله ونعم الوكيل).






**ئەولیایەکی خوا :**

گومانم نیە کە حاجی مەلاشەریفی سەعاتچی یەکێ بوو لە ئەولیاکانی خوا لەسلێمانی، کاك خەباتی کوڕی حاجی جەزای کوڕی حاجی مەلاشەریف وتی:

١-لەدوکانی باپیرم بووم لەسەرجادەی مەولەوی پیاوێك لەبەردەم جامخانەی دوکانی باپیرمدا سەیری سەعاتی کردو ڕۆیشت، باپیرم وتی : بڕۆ ئەو پیاوەم بۆ بانگ بکە ، ڕامکرد بانگم کرد، باپیرم پێی وت : ئەزانم پێویستت بەپارەیەو هەڵوێستەیەکت کردو ڕووت نەهات داوابکەی ، کابرا دەستی کرد بەگریان وتی : بەخوا ڕاستدەکەیت ، ئیتر باپیرم بڕێك پارەی دایەو کابرا دوعای خێری بۆکردو ڕۆیشت .

٢-لەماڵی باپیرم کەپرێکی نزیك بیست مەتر درێژ هەبوو زۆر جۆری مێوی لەسەر بوو ، چەند ئافرەت لەکاتی ترێ گرتنیدا تووڕەکەیان بۆ ئەدروو تا زەردەواڵە نەیخوات ، باپیرم دەیووت : کەس دەستی بۆ نەبات تا پێدەگات و بەشی دەکەین ، دوعام کردووە هەرچی دەستی بۆ بەرێت و بیخوات بڕشێتەوە ، جا دوعاکەی قبوڵ بوو هەرچی پێش پێگەیشتن لێی بخواردایە دەڕشایەوە .

٣-مستەفای برام شیرە خۆرە بوو ، باپیرم وتی : ئەمشەو لەخەوما دەستی مستەفا بەدەستی خۆشەویستەوە بووە(د.خ) ، بۆیە پشت بەخوا ئەم کوڕە ساڵح و خواناس دەبێت ، سوپاس بۆخوا ئێستا مستەفا هەرچەند بەشی رووپێوی پەیمانگای تەواوکردووە لە کۆمپانیای تیۆتا کاردەکات و سوپاس بۆ خوا شارەزایەکی باشە لە ئوصولی فیقهداو روو لەخوایە .

٤- باپیرم لە دوا ساڵەکانی ژیانیدا بەحاجی جەزای باوکمی وت: کە ژنێکی بۆ بدۆزێتەوەو باوکیشم ژنێکی خانەدانی گورجوگۆڵی ٧٥ ساڵی بۆ هێناو چەند ساڵێك خزمەتی باپیرمی کرد ، باپیرم پێی ناخۆش بوو دایکم خزمەتی دەکردو دەیووت : واجیبی ئەو نیە خزمەتی من بکات .

خزمان پێیان ناخۆش بوودەترسان شەریکە بەشیان بۆ پەیدابێت ، سەرەنجام باپیرم لە تەمەنی ٩٠ ساڵیدا لەبەردەرکی سەرا لەبەردەم کتێبخانەی سولەیمانیدا ئوتومبیلێك لێیداو کەوتە ژێر ئوتومبیلەکەوە ،

که خێرخوا دەریان هێنایەوە وتبووی : شۆفێرەکە ئازاد بکەن وپاش وەفاتیشی لەسەر وەسیەتی خۆی ئازادیان کرد.

چەند ساڵێك ئەو ژنەی بۆیان هێنابوو باوکم خزمەتی کردو ئەویش وەسیەتی کرد کەچی میراتی بەردەکەوێت بۆ باوکم بێت.

٥-حاجیەکی خەڵکی شاربازێڕ بۆی گێڕامەوەو وتی: لە تافی لاویدا بارم هێنابوو بۆ سلێمانی و ئەو بەیانیە نوێژم نەکردبوو ،لە دوکانی حاجی مەلا شەریف دانیشتم و کاك حاجی چکلێتێکی دامێ و وتی: کوڕم ئاگاداری نوێژی بەیانی بە ، من گریام و ئەویش گریاو دیاربوو خوا ئەو قسەیەی هێنا بەدەمیا تا من پەندی لێوەربگرم .



## گەشتی ژیان

**مامۆستا فایەقی ماندوونەناس :**

ناوی : فایەق نامیق محمدەو لەساڵی ١٩٤٣ لەکەرکوك لەدایك بووە .باوکی برایانی موسڵمانی خۆش ویستووەو لەکەرکوك سەردانی کردوون و ئەمەش وای لە مامۆستا فایەق کرد کە لەساڵی ١٩٥٩ دا بچێتە ریزی برایانی کەرکوکەوە.

پاشان بەکالۆریس لە ئیدارەدا تەواو دەکات و دەبێتە فەرمانبەر و دەگاتە پلەی بەڕێوەبەری پێشکەوتوو لە بەڕێوەبەرایەتی جنسیەو باری کەسێتی لە مەسیف سەلاحەدین .



ئەندامی نەقابەی نێودەوڵەتی رۆژنامەنووسانەو ئێستا بەرپرسی ناوەندی کۆمەڵایەتی مەڵبەندی دووی هەولێری یەکگرتووە .ئەم پیاوە نموونەی رەوشت بەرزی و هێمنی و لەخۆبووردنە و هاوشێوەی

مامۆستا عومەر ڕێشاوی ڕەحمەتی و مامۆستا حەمەد ئەمینی هەولێرو مامۆستا جەعفەری هەڵەبجەیە .

پەنجاو پێنج ساڵە (بەو هەموو بارو زرووفە ناهەموارەی بەسەر کوردوستاندا هاتووە ) لەسەر ئەو عەهدو پەیمانەی داویتی بەخوا لەخزمەتکردنی ئیسلامدا بەردەوامە و بەهەزاران وتارو بەرنامەو چالاکی پێشکەش کردووە لە هۆکارەکانی ڕاگەیاندندا بەزمانی کوردی و عەرەبی و تورکی .

برایەکی دەنگی یەکگرتوو دەڵێت:بەیانیەك مامۆستا هات بۆ ڕادیۆ تا کاتژمێر دوانزەی شەو ٢٤ ئەڵقەمان تۆمارکرد بە تورکی و عەرەبی لە بارەی ئیسلامەوە.

ئاو بوەستێ مامۆستامان ناوەستێ ڕۆژانە بەپێ یان بەتەکسی سەردانی مەڵبەند و ڕادیۆو تەلەفیزیۆن دەکات لە هەولێرو ئاڵتون کۆپری و کەرکوك و شوێنەکانی تردا .ڕۆژێك کەدەگەڕێتەوە بۆ هەولێر ئوتومبیلی دەستناکەوێت و سواری گەلاّبەیەك دەبێت ، هەرچەند لەوەزعەکە ئەمین نابێت،لە دڵی خۆیدا دەڵێت : ئێمە خۆمان وەقف کردووە بۆ خوا ، هەرئەوە دێتە ڕێمان کەخوا بۆی نووسیوین .

دەساڵ لە ئەوقاف ئیمام و بانگبێژ بووەو ، لە ڕابیتەو ئیغاسەش چەند ساڵێك سەرپەرشتیار بووە ،ئەم پیاوەباشە چەند جارێك بەخزمەتی گەیشتووم و لەگەورەیی خۆیەوە هانی داوم و دەستخۆشی

نووسینەکانی لێکردووم .لەرادیۆی هەولێر دیارییەکیان پێشکەش کرد وەك رێز لێنانێك ئەو برایەی پێشکەشی کرد دەستی ماچ کرد . بەراستی هەقە رێزی ئەم ماندوونەسانە بگرین ، چونکە خۆشەویست دەفەرموێت : لە ئێمە نیە کەسێك رێز لەگەورەمان نەگرێ و میهرەبان نەبێت بۆ بچوکمان .

**شێخ شەعراوی :**

لەساڵی ۱۹۱۱ لەدایکبووەو ساڵی ۱۹۹۸ کۆچی دوایی کردووە ، واتە ۸۷ ساڵ ژیاوەو لە تەمەنی شەست ساڵیەوە زیاتر ناوبانگی پەیداکرد.

شێخ شەعراوی بەڕەحمەت بێت لەچاوپێکەوتنێکدا لەبارەی ژیانی خۆیەوە دەڵێت :

( حەزم لە جوتیاری بوو ، بۆیە لەگەڵ ئەوەشدا کەلەپۆلی سێیەمی زانکۆی ئەزهەر بووم ، هەمیشە بیانوم بەباوکم دەگرتو نەم دەویست بخوێنم ، ساڵی یەك دووجار نامەم دەنارد بۆلادێکەمان و بەدرۆدەم ووت پارەو جلەکانم دزراون لەبەشی ناوخۆیی ، ئەویش لەبەر ئەوەی زۆر سوور بوو لەسەر خوێندنم ، بێباکانە جل وپارەوکەلوپەلی تری بۆ دەناردم ..

جارێك هات بۆلام لەقاهیرە ، تاپەڕاوی مەنهەجی پۆلی سێیەم بۆ بکرێت ، منیش لەگەڵیدا چوومە کتێبخانەیەکی گەورەو ژمارەیەکی

## گەشتی ژیان

زۆر کتێبم پێ کڕی کەگەڕاینەوە باوکم بەرگی نایلۆنی کڕیوتانوێژی بەیانی بەرگی گرتە کتێبەکانم .. پاشان بەیانی چووم خواحافیزی لێبکەم ، لەکاتێکدا لەشەمەندەفەرەکەدا دانیشتبوو منیش لەسەر شۆستەکە لە خزمەتیا وەستابووم پێی وتم : کوڕم شتێك هەیە دەمەوێ پێت بڵێم . منیش ترسام لەدڵی خۆمدا وتم : ڕەنگە دایکم شتێکی لێهاتبێت و ئێستا بیەوێ هەواڵم بداتێ ! بەپەرۆشەوە وتم : فەرموو ، وتی : کوڕم وامەزانە باوکت گێلە ، ئەو کتێبانەی تۆ پێویستە بۆپۆلی سێیەم تەنها چەند کتێبێکە ، بەڵام تۆ پارەی گامێشێکت بەمن دا بەکتێب .. ئیتر خواحافیزی کردو شەمەندەفەرەکە کەوتە ڕێ .

ئەم قسەیە لەناخەوە هەژاندمی و شەرمەزار بووم ، حەزم دەکرد ببومایە بەدڵۆپێ ئاو و بەناخی زەویدا بچومایەتە خوارەوە ، پاش ئەمە ڕێڕەوی ژیانم گۆڕی ، بڕیارم دا شەو و ڕۆژ بخەمە سەر یەکو بەچاکی بخوێنم و باوکم ڕازی بکەم .. بەمەش گەیشتمە ئەم ڕۆژەی کە دەیبینن .

منداڵ بووم لەمزگەوت دەم خوێند ، کچێکی خزممان هەبوو لەگەڵ ئێمە دا دەژیا لەڕەمەزاندا ڕۆژێك هاتمەوە بۆماڵەوە بینم ئاو دەخواتەوە ، لەوەوە ڕقم لێهەڵگرتو زۆر دژایەتیم دەکرد ..ڕۆژێك دایکم پێی وتم : کوڕی خۆم مەسەلە چیە ئەوەندە دژایەتی ئەو کچەی خزممان دەکەیت ؟ منیش وتم : بینیومە لەڕەمەزاندا ئاوی خواردۆتەوەو بەڕۆژو نەبووە .. دایکم دایە قاقای پێکەنین و وتی :

کورم ئافرەت کە باڵغ بوو توشی بێنوێژی دەبێت ، ڕۆژونوێژی لەسەر نابێت .. ئیتر لەوەوە فێر بووم کە بەروکەشی حوکم نەدەم بەسەرکەسداو هەمیشە (عوزر) بهێنمەوە بۆ خەڵك .

(محمد عبده یمانی) کەپێشتر وەزیری ڕاگەیاندنی سعودی بوو لەیادی وەفاتی محمد متولی شەعراویدا دەڵێت :

شێخ شەعراوی لەدەرگای هیچ کاربەدەستێکی نەداوە بۆ ئیشی خۆی ، نەچۆتە لایان مەگەر لەیادو بۆنە تایبەتەکاندا دەعوەتیان کردبێ ..شێخ شەعراوی دنیاو ئاخیرەتی بەچاکی گرتبوو بۆیە زۆر گرنگی دەدا بە جلو بەرگو ڕەنگوڕووی ، تەنانەت وەسیەتی بۆمناڵەکانیشی کردبوو کە گرنگی بدەن بەکفنودفن و بەخاك سپاردنەکەیشی .

شێخ شەعراوی لەهەق دا شەرمی لەکەس نەدەکردو سڵی لەهیچ نەدەکردەوە ، کاتێك بۆیەکەم جار دەچێتە مەککەو تەوافی کەعبە دەکات ، دەبینێ کە مەلیکی سعودیە دەیەوێت (مەقامی ابراهیم) بگوێزێتەوە ، بۆئەوەی ڕێ لەموسوڵمانان نەگرێ لەکاتی تەواف کردنی ماڵی خوادا ، زانایانی سعودیەش کەسیان قسەیان نەکردبوو لەو بارەیەوە ، بۆیە شێخ شەعراوی کە گەڕایەوە میصر نامەیەکی نارد بۆمەلیك و وتی : دەتانەوێ (مەقامی ئیبراهیم) بگوێزنەوە ، کاری وامەکەن و لەجێی خۆی بیهێڵنەوە چاکترە ، چونکە کاتی خۆی کە لافاومەقامی ئیبراهیمی لەشوێنی خۆی جولاند و حەزرەتی عومەر

ویستی دابینێتەوە ، پیاوێك هاتە لای و وتـی : مـن بـە گـوریس دوری نێوان مەقامی ئیبراهیم و کەعبەم پێواوە ، ئەوانیش بەو پێوانەو دوریـیـە دایان نایەوە لەجێی خۆیدا ..

کەنامەکە گەیشتە مەلیك ئەو شەوە خەوی لێنەکەوت و، هەربۆبـەیانی زوو فەرمانی داکەبیخەنەوە جێگاکەی خۆی ..

**تەفسیری شەعراوی:**

شێخ شەعراوی هەمیشە دەیوت :من تەفسـیری قورئـان ناکـەم بـەڵکو تەنها رازی(خواطر)ی قورئانیتان پێشکەش دەکەم .. ڕۆژێك لـە مەککە لەناو کۆمەڵێکی زۆر لەزاناکاندا تەفسـیری ئایـەتی ﴿عطـاء حسـابا﴾ی کرد زۆربەجوانی ، (علی طنطاوی)کە لەوێدا ئامادەبوو وتـی : یاشـێخ کتێبی تەفسیر نیە نەم خوێندبێتەوە ، تائێستا تەفسـیری واجـوانم نـەدیوە کەبەڕێزتان فەرمووتان ..

شێخ متەوەلی دەیووت :ئەم تەفسیرەم لە فەزڵی خواوەیەو هیچ ئازایەتی و هەوڵی منی تیانیە(انه فضل جود لامن المجهود).

دکتـۆر ئەحمـەد عومـەر هاشـم کـە ئەنـدامی مەجمـەعی بحـوث ی ئیسلامیەدەڵێت :کە تەفسیرەکەیان بۆ شێخ نووسیەوە تـا پیـا بچـێتەوە وتی: مـن مانـای فـەرموودەم بـاس کـردووەو یـەکێ راسـپێرن دەقـی فـەرموودەکان بنووسـێت ، دووکـەس کارەکانیـان بـۆ شـێخ دەکـرد پەیوەنـدیان پێـوەکردم کـەمن ئـەو کـارە بکـەم ،منـیش

وتم:باشە .وتیان :بەلأم جاریَ با ئەمە بوەستیَ تابزانین نەك شیَخ یەكیَكی تر دەستنیشان بكات .

كە ئەچنەوە بۆلای شیَخ پیَیان دەلَیَت : هیَی ئـەوەی بریارتـان لـەسـەرداوە دكتۆر ئەحمەد عومەر هەرئەو دانیَن ،ئەوانیش زۆر سەرسام بوون ، شیَخ ئەمەی چۆن زانی!!

**دوونمونە لەتەفسیری شیَخ شەعراوی**

**یەكەم** : خوا لـەبارەی پیَغەمبەر(د.خ)دەفەرمویَت ﴿وداعیا الی الله بأذنـه وسراجا منیرا﴾ الاحزاب/٤٦ .. (سراج) بەخۆر دەوتریَ ، جـا كاتیَـك خۆر هەلَدیَت خەلَكی هەموو چراكانیان دەكوژیَننـەوە ، چـونكە دنیـا بەجۆریَك رِوناك دەبیَتەوە كەمەگەر یـەكیَك بـەزیادە ئـەگینا پیَویـستی بەچراو گلَۆپ نیە .. هـاتنی محمـدیش (د.خ)هەروایـە ، جاهەركەسـیَ هەر رِیَبازو هەربەرنامەیەكی بۆخۆی هەلَبژاردبیَ بابیخاتە لاوە ، چونكە محمد (د.خ)رِیَ نیشاندەرە ، ریَ رِۆشنكەرەوەیە و خۆرە بۆمرۆڤایەتی .

**دووەم/** ﴿الرجال قوامون علی النساء بما فضل الله بعضهم علی بعض﴾ النساو/٣٤ ..

(قوامون) واتە (المبالغة في القیام في مصالح النساء ولـیس كـتم الانفـاس) هەولَـــدانی زۆر بۆهیَنانـــە دی قـــازانج وبەرژەوەنـــدی ئافرەتـــان و جیَبـــەجیَ كردنی كاریـــان نـــەك دەســـت خســـتنە بینـــە قاقایـــان و چەوساندنەوەیان .. خۆلیَرەدا مەبەست لە ژنـان تـەنها هاوسـەر نیـە ،

بەڵکو مەبەست دایکە ، خوشکە ، کچە . جاکێ‌هەیە بڵێ پیاو دەبێ کوێخایەتی‌و زۆرداری بکات بەرامبەر هاوسەرو دایك وخوشکو کچەکەی .. دیارە ئیسلام بەشتی وا هەرگیز ڕازی نابێ .. بەڵکو تەواو ترە بڵێین دایك و خوشك و کچ و هاوسەر پێویستییان بەکوڕو باوکو براو مێردە کە کارو فەرمانیان بۆجێ‌بەجێ بکەن و هاوکارو هاودەمیان بن .. ئەوەش کە دەفەرموێ ﴿ بمافضل الله بعضهم على بعض ﴾ ئەوە دەگەیەنێ کە چ پیاو و چ ئافرەت هەریەکەیان لەلایەنێکەوە فەزڵی تایبەتی خۆیانیان هەیە و هەریەکەشیان تەواوکاری ئەوی تریانە .

هەروەك لە سورەتی (آل عمران/١٩٥)یشدادەفەرموێ : ﴿ فاستجاب لهم ربهم أني لاأضيع عمل عامل منكم من ذكر أو أنثى بعضكم من بعض ﴾ واتە :

پەروەردگاریان نزاو پاڕانەوەکەیانی وەرگرت و پێی فەرموون من کردەوەی هیچ کەسێك بەفیڕۆنادەم و، پاداشی نێرو مێ هەرکەسە بەگوێرەی خۆی دەدەمەوە ، نێرو مێ شان بەشانی یەکتری لەماف و ئەرکدا یەکسانن ، (بعضكم من بعض) بڕێکتان لە بڕێکتان پەیدا دەبن ، نێرومێ لەیەك ڕەگەزنویەك ڕەچەڵەکیان هەیە ، مێ لەنێر پەیدا دەبێ‌و نێر لەمێ پەیدا دەبێت . جا کە پیاو لە ژن بێت و ژنیش لە پیاو ئیتر چەوساندنەوەوستەملێکردن چۆن ئیسلام پێی ڕازی دەبێت!

**شێخەکەی شەعراوی**

لەسەرەتاوە ئیمام بەننا دەناسێت و یەکەم بەیانی ئیخوان شەعراوی دەینوسێت ، بەڵام پاش تێکچوونی بەینی ئیخوان و وەفد وازی لەئیخوان هێنا چونکە لە بواری سیاسەتدا دڵی بەوەفد خۆش بوو.

ساڵی ١٩٦٣ هەڵیدەبژێرن بەسەرۆکی بەعسەتێك بۆ جەزائیر ئەمیش حەزناکات بچێت .شەو خەو بەپیاو باشێکەوە دەبینێت کەنایناسێت و پێی دەڵێت : وەرە بۆلامان بۆ جەزائیر! کەدەچێت بۆ جەزائیر لەساڵیادی هەشتەمینی سەربەخۆیی جەزائیردا لە کۆشکی کۆماری چاوی بەزانایەك دەکەوێت کە ئەو پیاوەبووە چۆتە خەوی ، ئەچێتە لای باوەشی پیادەکات و دەبێتە موریدی و حەوت ساڵ لەجەزائیر دەمێنێتەوە ئامادەی هەموو وانەکانی دەبێت .

ئەو زانایەش ناوی شێخ محمد القاید ەو زانایەکی پایەبەرزی سۆفی سەلەفی جەزائیربوو . لەنەوەی حەزرەتی حەسەنەو زۆر بۆخوا سوڵحاوبوو.ئەوەی سەیرە ئەمیش ساڵی ١٩١١ لەدایکبووەو ١٩٩٨ دا وەك شەعراوی کۆچی دوایی کرد.

ئەم پیاوە سەردەستەی رێبازی قایدی هیبری شازلی بوو، لەسەردەستی ئەمدا شەعراوی هەنگاوی ئیمانی وپاکردنەوەی دەروونی ناو بوو بەو شەعراویەی کە رۆڵێکی گەورەی بینی .

جا رێبازی ئیخوان کە گشتگیرەو لەپاکردنەوەی دەروونندا سۆفیەکی راستەقینەو لە پابەندبوون بەسوننەتیشەوە سەلەفیەکی ساڵحەو کاربۆ

دونیاو قیامەت دەکات و سیاسەت و دەوڵەتداری بە بەشێك لەدین دەزانێت ، ئەمڕۆ من کەمبوونەوەی تەزکیەو بۆ خوا سوڵحان دەبینم لای هەندێکمان کەئەمەش ئاگادارکردنەوەو کار بۆکردنی دەوێت ، چونکە ئەگەر لە زەمانی خۆشەویستدا(د.خ)و لەجەنگی ئوحودا صحابە هەبووبێت دونیای ویستبێت (منکم من یرید الدنیا ) خوا دەرسی دادان و بەو شکستەیان هێنانیەوە سەر راستە رێ ،دیارە ئێستاش لەو چەشنەمان زۆرە ،بەڵام ئاخۆ چۆن بتوانین چارەسەریان بکەین ، دیارە ئەوە ئەرکی سەرکردایەتیەکە چارەسەری بکات.





## پیاوێکی بەبەرەکەت:

دکتۆر شەریف ئەبو نەجا لەمیسر دەڵێت : ڕۆژێك ساڵی ١٩٩٩ لە پەیمانگای شێرپەنجە لەمیسر سیانزە مناڵ مردن بەهۆی کەمی ئیمکاناتەوە ، ئەوە زۆر بێتاقەتی کردم، ئەو ڕۆژە بەخزمەت شێخ شەعراوی گەیشتم و حاڵەکەم بۆ باسکرد ، ئەویش ١٥٠ جونەیهی دامێ وتی : تامابم هەموو مانگێك ئەوەندەت ئەدەمێ ، کەمردیشم وەرەسەکەم هەموو مانگێك ئەوەندەتان ئەدەنێ ، ئەمە بووە هۆی بیرکردنەوەمان لە بەخشینی خێرخوازان بۆ ئەو پرۆژەیەو بەبەرەکەتی ئەو بەخشینەی ئیمام بیرکرایەوە لەخەستەخانەی تایبەتی چارەسەری شێرپەنجەی منالّ و سوپاس بۆ خوا لە ٢٠٠٧ دا کرایەوە ، شایانی باسە

## گەشتی ژیان

سالانە نزیکەی دەهەزار مناڵ تووشی شێرپەنجە دەبن لەمیسردا و لەو خەستەخانەیەدا بە خۆڕایی چارەسەریان بۆ دەکرێت .



**سەرگوزەشتەیەکی سەیر**

شێخ شەعراوی لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا: ( وهُو الذي فِي السَّمَاءِإِلَه وفِي الْأَرْض إِلَه وهُو الْحَكِيمُ الْعَلِيمُ )(٨٤)الزخرف. (هەرئەوە لە ئاسماندا خودایەو لە زەمینیشدا خودایە و هەر ئەویشە لەکارزانەو زۆر زانایە) . دەڵێت:

لە مزگەوتی ئەحمەدی بووین لەگەڵ مامۆستایەکی تەفسیر شێخ ئەبو العینین و شێخ شلتوت یش هات کەشێخی ئەزهەر بوو ، مامۆستاکە وتی : لە وانەی تەفسیردا ئەم ئایەتەم باسکردووەو یەکێ پرسیارێکی لێکردم کە مادام وشەی (اله) دووجار هاتووەو نەکیرەیە کەواتە دووخوای جیاواز دەگرێتەوە ، ئەگەر هەردووکیان مەعریفە

بوونایە مەبەست یەك خوا دەبوو ، لەم قسەو باسانەدا بووین ، پیاوێکی گۆچان بەدەست هاتە ژوورەوە کە نە لەوەو پێش بینیبوومان و نەدواتریش بینیمانەوە ، هەر لەدوورەوە بەبێ ئەوەی ئاگای لەهیچ بووبێت وتی : ئەی زاناکان ئەو نیسمی مەوصولەتان بیرنەچێت . تا نیو سەعات هەرسێکمان ئەبلەق بووین و قسەمان بۆ نەکرا .

ئەوەش خوا ویستی ئاگادارمان بکاتەوە کە بەهۆی ( الذي) یەوە (اله) کە بووە بە مەعریفەو بەوەش هەردووکی مەبەست یەك خوایە .

**شێخ شەعراوی و مەریەم فەخرەدین**

مەریەم فەخرەدین ، ئەکتەرێکی میسریەو دەڵێت : لەتەمەنی چوارساڵیەوە خستمیانە قوتابخانەیەکی ئەڵمانی لەمیسر ، تا دوانزە ساڵیش دەرسی دینی مەسیحیم دەخوێندو وەکو ئەوانم دەکرد ، تا رۆژێك باوکم پێی وتم : کچم تۆ موسڵمانیت ، ئنجا هات بۆ قوتابخانەکەم و وتی : مەریەم موسڵمانەو ئیتر ئەوانیش وانەی ئاینیان پێنەدەووتم و خەریکی شت چنین و وێنەکێشان دەبووم لەکاتی ئەو وانەیەدا .

دایك و باوکم و پوورم و خزمانم لەبەرچاوم نوێژیان دەکرد بەلاّم کەس نەیدەووت نوێژبکەو منیش گوێم پێنەئەدا .جارێك بۆ فلیمێك وتیان: لە دەورەکەدا فاتیحە بخوێنە ، منیش نەمدەزانی، بۆیان نووسیمەوەو لەبەرمکرد ، سبحان اللە هەرچی بۆ فلیمەکان لەبەرم کردووە لەبیرم چوونەوە تەنها فاتیحەکە نەبێت .

لەتەمەنی پەنجا ساڵیدا بەیانیەك لەخۆمەوە هەستام وەك نوێژخوێنان چەند جووڵەیەکم کردو فاتیحەکەم خوێند ، ئنجا تەلەفونم بۆ شادیە کرد کەئەو پێشتر تەوبەی کردبوو داپۆشراوبوو ، ئەویش نامیلکەیەکی بۆناردم (المسلم الصغیر ) لەسەر نوێژکردن ، هیچ حاڵی نەبووم ، تومەز بە شێخ شەعراوی وتبوو ، جەنابی شێخ تەلەفونی بۆکردم و وتی : ئێستا باشتر نیە کە نوێژدەکەیت ؟؟

وتم :دیارە باشترە بەڵام تاقەتی دەستنوێژم نیە ، هاوین بوو ، وتی : قەیناکە لەجیاتی دەستنوێژ بۆ هەموو نوێژێك دوشێك بکە ، کەزستان هات وساردبوو نەمدەتوانی بۆهەرنوێژێك دوش بکەم ناچار دەستنوێژم دەگرت . ئنجا کە پوورم تەحیاتی بۆ شەرح کردم لەبەرم کردو لەنوێژدا دەمخوێند . لە قوتابخانەی ئەڵمانی فێری جددیەتیان کردبووین بۆیە لە بەیانیدا بە چاکی هەڵدەستام بۆ نوێژو نەئەنووستمەوە ، نوێژەکان هەموو لەکاتی خۆیاندا دەمکردن، ئەگەر دوای نوێژی ئێوارە بنووستمایە ئەوا دووی شەو هەڵدەستامەوەو تا نوێژی بەیانی نەدەنووستمەوە .ئیتر وام لێهات ژیانم هەموو پەیوەست بوو بەنوێژەوە .

ئەمە وەك ئەوەی مەولەوی وایە ،کەسێك پێی دەڵێن نوێژ بکە ، ئەویش دەڵێ :من نوێژی بەیانیم پێناکرێت ، مەولەویش پێی دەڵێت : جارێ چوار نوێژەکە بکەو بەیانیان قەیناکە ، کەئەم هەواڵە بڵاودەبێتەوە ، ئەبێ بەهەڵا گوایا مەولەوی فەتوای داوە چوار نوێژ بکرێت ، ئەویش لەوەڵامیاندا دەڵێت : من بەتەنها چوار نوێژم

پێکردووه و ئەگەر راست دەکەن ئێوه بەهەمووتان ئەو نوێژەی تری پێبکەن .

سەرۆکی زانکۆیەك لەمیسر بڕیارێکی دەرکرد کەنابێت ئافرەتانی بالآپۆش بەو جلانەوه بێنه زانکۆوه ، چی وتیان ئەوه فەرمانی خواو پێغەمبەره سوودی نەبوو ، شێخ چوو بۆلای و قسەی خۆشی بۆکردو پاشان پێی وت: هەواڵێکم پێگەیشتووه ، که بڕیارت داوه بالآپۆشەکان بەو جلانەوه نەیەنه زانکۆوه ، ئیتر نازانم تاکوێ راسته ؟؟

ئەویش وتی : راسته ئەمەوێت جیاوازی نەبێت لە نێوان قوتابیه کچەکاندا و ئیحراجی بۆ سفوورەکان دروست نەبێت .

ئەویش وتی : باشه بۆ رێی سفوورەکان ئەدەی بێنه حەرەمی زانکۆوه ،لەکاتێکدا بۆ خوێندن دێن و هەق نیه هەموو بەرگێك بپۆشن .

وتی : ئەوه ئازادی تاکەکەسیه ، وتی : زۆر باشه کەواته بڕوات بەئازادی تاکەکەسی هەیە؟ وتی : بەڵێ .

وتی : زۆر باشه هەر لەبەر ئازادی تاکەکەسیەکەش رێی بالآپۆشەکان بدە چی دەپۆشن ئازادبن و کابراش بوو بەقسەی خۆیەوەو بەناچاری قایل بوو ، بەمجۆره ئەم کابرایه که بەفەرموودەی خواو پێغەمبەر نەگیرا به مەزهەبەکەی خۆی گرتی .

**شێخ و جیهان سادات:**

ژنی سادات داوای لێدەکات وتارێك بۆ ژنانی یانەکەی بدات ، ئەویش قایل دەبێت بەو مەرجەی خۆیان داپۆشن ، کە دەچێت سەیردەکات جلی سفوریان لەبەردایە بەجێیان دەهێڵێ ووتارەکە نادات.

جارێك ساداتیش باسی کەسێك دەکات کە دەرچووی ئەزهەرەو دەڵێت: وەکوسەگ راپێچی زیندانکرا ، ئەمیش تەلەفونی بۆدەکات و دەڵێت: ئەزهەر پیاو تەخەروج پێدەکات نەك سەگ.

**سەرۆکی بۆسنە:**



دوای گیان سپاردنی سەرۆکی گەورەی بۆسنی پزیشکەکان چەند دێڕهۆنراوەیان بەزمانی بۆسنی لا دۆزیەوە کە ئەوە ماناکەیەتی .

## گەشتی ژیان

پەیامێك بۆ خودی خۆت ، ئەگەر شان و شکۆت بگاتە کەشکەشانی ئاسمان ئەوا چارەنووس و کۆتایت هەر مردن دەبێت .

هەرچەند بەجوولەو گەشتەکانت خۆرهەلأت و خۆرئاوا بگەڕێیت ، سەرەنجام پشوویەکی یەکجاری بدەیت و لەجوولە بکەویت. لەدرێژایی ژیانتا پێشوازی لەژمارەیەکی زۆر میوان دەکەیت ، بەلأم لە کۆتاییدا میوانێکی نەویستراو هەردەبێت سەردانت بکات .

هەموو شتێك کۆتایی پێدێت ، بۆ ئەوەی دوای مردن سەرلەنوێ ژیانت دەست پێبکەیتەوە، ئەم جیهانەش کۆتایی دێت و دەمرێت ، جا لەبەرئەوە دامەزراوو خۆ ڕاگربە لەسەر ڕێگای ڕاست.

**دوویادەوەری :**



## گەشتی ژیان

مەلا محمدی رەبیعی یەکێکە لەزانا ناودارەکانی سوننەی ئێران ، کە رۆڵێکی باشی بینیوە بەدرێژایی تەمەنی لەخزمەتی خواو خەڵقی خوادا ، لەسەرداوای هەقی کوردو سوننە بە رووداوێکی تەمومژاوی لەوە دەچێت شەهیدکرابێت .

ئەم زانایە دەنگی زۆر خۆش بوو لەشەستەکاندا وەك قورئانخوێنێکی ئێرانی لەپاکستان بەشداری پێشبڕکێیەکی قورئان دەکات کە مامۆستا عبدالباست و حوصەریش ئامادەبووبوون ، حوصەری یەکەم و ئەمیش دووەم بوو ، عبدالباست بە رەبیعی دلآن بانگی دەکردو جاروبار جلە کوردیەکانی ئەمی لەبەردەکردو وتبووی کەئەویش کوردەو خەڵکی شەقلآوەیە .

یادەوەری یەکەم : مەلا محمدی رەبیعی لەسنە ئەچێتەچایخانەی شوکری ناوێك و بەفارسی داوای بەفر دەکات ، شوکریش بەسەرسوڕمانەوە دێتە لای و دەڵێت : مامۆستا بۆ بەکوردی داوات نەکرد ئێوەی مامۆستاو پێشەوا زمانەکەمان نەپارێزن ئێمەی عەوام و نەشارەزا چی بکەین ، ها ئەوە چەقۆیەك زمانم ببڕە با نەجاتم بێ و هەرقسەی پێنەکەم ، مامۆستا داوای لێبوردن لەشوکری دەکات و دوای ئەوە هەمیشە دوعای خێری بۆدەکات و فاتیحە بۆ گیانی دەنێرێت کە ئەو راستیەی بیرخستەوە کە زمانەکەی خۆی لەیاد نەکات .

یادەوەری دووەم: مامۆستا کە ئەبێتە مەلا ئەچێتەمزگەوتی دێیەك لە ئێران مامۆستاکەیان نەخۆش دەبێت تانوێژی تەراویحیان بۆ بکات ، خەڵکەکە لەمامۆستا دەپرسن نیەتی تەراویح بێنن یان گێڕانەوەی نوێژە فەوتاوەکانیان ، ئەویش دەڵێت : کێ قەرزارە بانوێژ بگێڕێتەوە ، بۆ سبەی شەو مەلا ی مزگەوتەکە کە نەخۆشە دەنێرێت بەدوایداو پێی دەڵێت : خەوم بە خۆشەویستەوە بینیوە(د.خ) فەرمانت پێدەکات کە خەڵکەکە نیەتی تەراویح بهێنن .

شایانی باسە مامۆستا خەمی زۆری کتێبی باقیاتی صالحاتی دەبێت کەچاپ بکرێت ، شەو لەخەودا بەخزمەت خۆشەویست دەگات(د.خ) و ئەوەش زۆر دڵی خۆش کرد .

**بەسەرهاتی قەشەیەك:**

قەشەی ئیسپانی کاسۆلیکی ئیدواردۆ ماریا غومینز کەتەمەنی ٨٧ ساڵەو ٤٣ ساڵ لە دوورگەی جافای ئەندۆنیسی خەریکی بلاوکردنەوەی مەسیحیەت بووە ، ١٧ مانگ بێهۆش دەبێت لە ئەنجامی کەوتنە خوارەوەوە ، کەدێتەوە هۆش خۆی لەخەستەخانە دەڵێت : هەرچەند من قورئانم نەخوێندۆتەوە شارەزای ئیسلام نیم ، بەلاّم خوا خستویەتیە دڵمەوە کەناوی (الله)یەو ئیسلام دینی هەقە ، بۆیەمن موسڵمان دەبم ، بەمەش نیوەی لایەنگرانی موسڵمانبوون چونکە

متمانەی زۆریان پێیەتی و ئێستا بەتەمان کەنیسەکەیان بفرۆشن و هەندێ پارە کۆبکەنەوەو مزگەوتێك دروست بکەن .

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەخوایە هیدایەت ئەداو پەکی لەکەس نەکەوتووە و ئەوە ئێمەین ئاتاجمان بە خواو بەرنامەکەیەتی ( بَلْ لِلَّهِ الأَمْرُ جَمِيعًا أَفَلَمْ يَيْئَسِ الَّذِينَ آمَنُوا أَنْ لَوْ يَشَاءُ اللَّهُ لَهَدَى النَّاسَ جَمِيعًا وَلَا يَزَالُ الَّذِينَ كَفَرُوا تُصِيبُهُمْ بِمَا صَنَعُوا قَارِعَةٌ أَوْ تَحُلُّ قَرِيبًا مِنْ دَارِهِمْ حَتَّى يَأْتِيَ وَعْدُ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ لَا يُخْلِفُ الْمِيعَادَ (٣١)**الرعد**).



## گەشتی ژیان

**ئەوەیە بانگخواز:** فەریدی فلیپینی کە بەهەزارەها کەسی موسڵمان کردووەو هەموو ژیانی بۆ باگەوازبووە ، وا لە خەستەخانەیەو جەڵتە لێی داوە ، بەوحاڵەشەوە پەرستارێکی ئافرەت و دوانزە کارمەندی خەستەخانە لەسەر دەستیا موسڵمانبوون.



**گەیشتویتە کوێ؟؟**

**ئیسلامەتی چەند پلەیەکەو هەوڵی زۆری دەوێت تا بگەینە پلە بەرزەکان ، قورئان دەفەرموێت: بَلَى مَنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَلَهُ أَجْرُهُ عِنْدَ رَبِّهِ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ (١١٢) البقرة**

**وَمَنْ يُسْلِمْ وَجْهَهُ إِلَى اللَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَى وَإِلَى اللَّهِ عَاقِبَةُ الْأُمُورِ (٢٢) لقمان، واتە:هەرکەسێك بەدڵێکی پاك رووڵەخوابێ و ئاکارچاك بێ ، دیارە ئەڵقەی هەرەپتەو ئەوگرتوویەو ئاکامی هەموو کارێکیش بەرەو خوایە ..**

**وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا مِمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ وَاتَّبَعَ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا وَاتَّخَذَ اللَّهُ إِبْرَاهِيمَ خَلِيلًا (١٢٥)النساء**

**لەسەرەتای هەموو نوێژێکدا ئەڵێین (وجهت وجهى للذى فطر السماوات والارض حنيفا مسلما وما أنا من المشركين ،ان صلاتي ونسكي ومحياى ومماتي لله رب العالمين لاشريك له وبذلك أمرت ).**

**دەبێ لەکاتی نووستنیشدا رووڵەخوابین (اللهمَّ أَسْلَمْتُ نَفسي إليكَ ، و وجَّهْتُ وجْهِي إليكَ ، و فَوَّضْتُ أَمْري إليكَ ، و أَلْجَأْتُ ظَهْرِي إليكَ ، رَغْبَةً و رَهْبَةً إليكَ ، لا مَنجا و لا مَلْجأَ مِنْكَ إلَّا إليكَ ،**

# گەشتی ژیان

آمَنْتُ بِكتابِكَ الذي أنْزَلْتَ ، و بِنبيِّكَ الذي أَرْسَلْتَ ، قال رسولُ اللهِ : مَنْ قالهُنَّ ثُمَّ ماتَ تَحْتَ لَيْلَتِه ماتَ على الفِطْرَةِ )

الراوي :البراء بن عازب المحدث :الألباني -المصدر :صحيح الأدب المفرد - صحيح ..

مەسەلەی ئاراستەو رووگە زۆرگرنگە، وەك ئەوەیە لە بیابانێکی کاکی بەکاکیدابیت و داوات لێیکرێت لەو گەشتەتدا کاتژمێر یان قیبلەنما هەڵبژێری، کامیان هەڵبژێری رزگارت دەبێت ؟؟

ئنجا پرسیارەکە ئەمەیە ئاخۆ بەراستی روومان کردۆتە خوا ، ئایا لەگەڵ ئەوەدا کە روومان لەخوایەگەیشتوینەتە ئیحسان کەهەست بکەین خوای بالآدەست دەبینین ، خۆ ئەگەر ئێمە نەشی بینین ئەو ئێمەدەبینێت؟



## ئەو وابلێ ئێمە بلێین چی !!

عیمرانی کوڕی حصین لە حەوتی کۆچیدا بەیعەتی دا بەخۆشەویستمان(د.خ) وبیستی کەهاوەڵان بەخۆشەویستیان وت : کە لەلای تۆدەبین دەکەوینە حاڵەتێکی رۆحی واوە خەریکە باڵ دەگرین ، کە دەڕۆینەوە ناوماڵ ومناڵ وانامێنین .

ئەویش فەرمووی : ئەگەر لەسەر ئەو حاڵەی لای من بەردەوام بن ، ئەوا مەلائیکەتان لەڕێگاوبانەکاندا دەبینن و تەوقەتان لەگەڵ دەکەن ، دیارە سەعاتەو سەعاتە و ناتوانن بەردەوام لەوحاڵەدابن ).

عیمران دیارە زۆرماندووبوو لەگەڵ رامکردنی نەفسی خۆیدا بۆیە هەستی دەکرد مەلائیکەت سەلامی لێدەکات،ماوەیەك نامێنێ ودواتر ئەوحاڵەتەی بۆ دەگەڕێتەوە، بۆیە بە مطرف کوڕی عبدالله ی شەخیر دەڵێت : سەلامی مەلائیکەتانم نەمابوو بۆم هاتەوە ،ئەگەر مام باسی مەکە کەمردیشم کەیفی خۆتە ئەگەر باسی بکەیت .

ئەوەی سەیرە خوا بەو پلە بەرزەیەوە نەخۆشیەکی بۆنارد سی ساڵ بەردەوام بوو ، کەدڵخۆشیان دەدایەوە دەیوت : ئەوەی خوا پێی خۆش بێت منیش پێم خۆشە !

ئنجا بەو پلەیەشەوە دەترساو دەیووت : خۆزگە خۆڵەمێشێکی دەم رەشەبا بوومایە .

لەسەرەمەرگا لەساڵی ٥٢ەی کۆچیدا لەبەصرە وەسیەتی کرد: کەگەڕانەوە لەناشتنم ئاژەڵ سەربڕن و چێشت و گۆشت بخۆن و ببەخشنەوە .وەك ئەوەی مردنەکەی موناسەبەیەکی خۆشی بێت، دیارە زانیویەتی بەرەو کوێ دەچێت .

**دکتۆر خالید جوبەیر**



## گەشتی ژیان

ناوبراو پزیشکێکی جەراحی دڵی سعودیە وساڵی ١٩٥٤ لەدایکبووەو لەساڵی ١٩٨٠لە قاهیرە کۆلێژی پزیشکی تەواوکردووەو لەساڵی ١٩٩٣ دا بۆتە راوێژکاری نەخۆشی دڵ و ٣٥ دیراساتی هەیە لەسەر دڵ ولە گۆقارە بیانیەکاندا بلاٌوی کردۆتەوە ، **لەبارەی ژیانی خۆیەوە دەڵێت:** دایکم ناوی (سارە) کچی ئیبراهیم (الحقیل)ە ، باوکی خۆمم نەدیوە و بەبێ باوکی گەورەبووم ، چیرۆکیشم لەگەڵ دایکمدا لە ١٩٥٤/١٢/٢٧ ەوە دەست پێدەکات کە لەشەوی ٢٧ دا لەسەعات ٣,٥ ی شەودا لەدایك بووم ، کەدایکم منی گرت بەدەستەوە هەستی کرد خوێن لەپشتم دێت ، کەسەیری کرد چاڵێك لەپشتما بوو خوێنی لێدەهات ، خۆی و نەنکم تا بەیانی بەنۆرە دەستیان لەسەر پشتم دادەنا تا خوێنی لەوە زیاترم لێنەڕوات .

دکتۆر لەوناوچەیەی ئێمە نەبوو تەنها پەرستارێك هەبوو ئەویش نەیتوانی هیچم بۆبکات ، حاڵەتەکەم خەتەر بوو ، لەوانەبوو توشی ئیفلیجی یان مردن ببم ، کەچی خوا ئافرەتێکی دەشتەکی نارد ، کەحاڵەتەکەیان پیشاندا ، وتی : ئاسانە هیچ نیە ، پیسایی کردووە ، وتیان بەڵێ ، وتی : چاڵەکە پیسایی خۆی بخەنە سەر ، دوو سێ جار

خستبویانە سەری و خوا کردی بە شیفا بۆم ، ئەگەر وانەبوایە من هەرئەو کاتە دەمردم .(مەبەستی ئەو پیساییە رەشە بووە کە یەکەمجار منالّ دەیکات کە ئەو گریسەیە کە ریخۆلەکانی داپۆشیوە تا بەیەکا نەلکێن تا منالّەکە دێتە دونیاوە) .

سالێك تەمەنم تەواوکرد و توشی میزگیران بووم ، سێ رۆژ میزم بۆنەکرا و تەواو ئاوسام و لەهۆش خۆم چووم ، پەرستاری ناوچەکە نەیدەزانی چیم بۆبکات ، تا خوا ئافرەتێکی دەشتەکی نارد کەباسی حالّەکەمیان بۆ کرد وتی : ئاسانە ، برنج بێنن بیکولێنن و ئاوی برنجەکەم بۆ بهێنن برنجیان کولاّند و ئاوی برنجەکەیان بۆ هێنا کە تۆزێ سارد بووە وە منی تێخست ، پاش ١٠ دەقیقە بەردێکم فرێ داو میزەکە بەربوو ئەمجارەش خوا لەمردن رزگاری کردم ، ئێستا لەبەرچاومە ئەبێ دایکم چەند شپرزە بووبێ بۆ ژیانی من و هیچیشی لەدەسەلاّتا نەبووە بیکات .

لەتەمەنی سێ سالاّنیشدا تووشی حالّەتی بورانەوە بووم ، دایکم دیسانەوە گیری خوارد بەدەستمەوە ، بەو هەژاری و نەداری و بێوەژن کۆشیە نەیدەزانی چیم لێبکات ، ئەمجارەش خوا ئافرەتێکی دەشتەکی نارد کە دیارە ئەوانە بەئەزموونی خۆیان هەندێ چارەسەریان لایە ، ئەو

ئافرەتە پشت سەرمی بریندارکرد و داخی کرد ،سبحان الله ئەمجارەش نەمردم و بەوەچاك بووم .

ئنجا کەتەمەنم ١٠ ساڵان بوو بیرم دێ بەدایکمم وت : کێکم دەوێت ، کوڕی فلأن کەس کێکی پێ یە ، وتی : کوڕم ئێمە هەژارین پارەمان نیە ، کێك ئارد و هێلکەی دەوێت .

لەبەرمن سێ ڕۆژ کارەکەری ماڵانی کرد بۆئەوەی پارەی کێك بۆمن پەیدا بکات و کێکم دەرخوارد بدات .

جا بۆیە کە دایکم لەتەمەنی ٥٤ ساڵیمدا وەفاتی کرد زۆرگریام ، هەستم کرد وەك منالێکم کە فرێدرابێتە سەرشەقام ، هەستم بەتەنهایی و هەتیوی کرد ، بەڕاستی دایکم وەك بەلوعەیەکی خێر وابوو بۆمن ، بەداخەوە ئەو دەرگای خێرەم لێ داخرا .

ئەمریکیەك دەڵێت : ئەگەر کەسێك تەمەنی حەفتا ساڵیش بێت و دایکی بمرێت هەر هەست بەتەنهایی دەکات وهەست بە ونبوون دەکات. بۆیە من هەموو دایکێك وەك دایکی خۆم تەماشادەکەم و ڕێزم هەیە بۆیان ، بەوانەی کە دایك و باوکیان ماوە دەڵێم : باش بن لەگەڵ دایك و باوکتانا ، بەهەشت وا لەژێر پێی دایکتانا، نەك پێی دایکتان

بەڵکو پێڵاوەکانیشیان ماچ بکەن ، چونکە ئەوان بەو پێڵاوانەیان پێ دەنێن بەبەهەشتدا .

**شیفا لای خوایە :**

دکتۆر خالید جوبەیر کە پزیشکەو نەشتەرگەری دڵ دەکات لە سعودیە و بانگخوازە دەڵێت : برادەرێکی خواناسم کە ئەهلی رۆژوو شەونوێژە بۆی گێڕامەوەو وتی : پار رەمەزان لە رووداوێکی ئۆتۆمبیلدا زۆر بەخرابی قاچم شکاو چوومە خەستەخانەی مەدینەوپزیشکەکان وتیان: ئەبێ قاچت ببڕینەوە ، زۆر داوای لێبوردنم لە خوا کردو زۆر پاڕامەوە ( من لزِمَ الاستغفارَ جعلَ اللّٰهُ لهُ من كلِّ ضيقٍ مخرجًا ومن كلِّ هم فرجًا ورزقَه من حيثُ لا يحتسِبُ ) الراوي : عبدالله بن عباس -المصدر :الأحكام الصغرى صحيح الإسناد.

شەو لە خەودا حەزرەت (د.خ) پێی فەرمووم : قاچت مەبڕەوە ، بەئیزنی خوا چاك دەبێت وبە پێی خۆت دەڕۆیت .وتم : تۆ کێیت ؟ وتی : من (محمد) م پێغەمبەری خوا.

بۆبەیانی دکتۆر وتی : ها چی دەڵێیت ؟ وتم :لەسەرخوا نایبڕمەوە .

# گەشتی ژیان

سبحان الله دوای سێ رۆژ بە فرۆکە بردیانم بۆ خەستەخانەی عەسکەری و دکتۆر موسەدید پێنج نەشتەرگەری بۆکردم و لەسایەی خواوە چاك بووم.

خوای گەورە دەفەرموێت : {وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مَخْرَجاً ،وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ إِنَّ اللَّهَ بَالِغُ أَمْرِهِ قَدْ جَعَلَ اللَّهُ لِكُلِّ شَيْءٍ قَدْراً }الطلاق٣

هەرکەس لەخوا بترسێ دەرووی لێدەکاتەوەولە شوێنێکەوە بژێوی بۆ دەنێرێ کە بەخەیاڵیدا نایە و،هەرکێ خۆی بەخوا بسپێرێ ، ئەوی بەسە ، خوا بەمەبەستی خۆی دەگاو هەرچی بوێ دەیکا ، دیارە خوا بۆ هەرشتێ ئەندازەیەکی داناوە .

**سەرەمەرگ:**

دکتۆر خالید دەڵێت:لەماوەی کارکردنما لەخەستەخانە کە ٣٢ ساڵە ، شەش حاڵەتم بینی لە پیاوو ئافرەت کەلەسەرەمەرگ و گایانەڵایاندا مەلائیکەی رەحمەتیان بینیوە ، وەحاڵەتێکیشم بینی کە مەلائیکەی عەزابی بینی .

**یەکەم/** لەرۆژی شەممە ٦/شەعبان/١٤٠٦ ی کۆچی واتە ٢٨ ساڵ لەمەوبەر لەخەستەخانە خەفەربووم نوێژی ئێوارەم لەمزگەوتی خەستەخانەکە کرد، پەرستارێك تەلەفونی بۆکردم کە فلانە نە خۆش

حاڵی خراپە و لەدەستی ڕاستیەوە کانیۆلاکەی بۆدانراوە ئیش ناکات ، بەڵکو بێت لەدەستی چەپیەوە بۆی دابنێت .

ئەم نەخۆشە تووشی شێرپەنجە بووبوو ، پێنج مانگ ئاگای لەخۆی بوو قسەمان دەکرد لەگەڵیا ، مانگی شەشەم بێهۆشی تەواو بوو شێرپەنجەکە گەیشتبووە مێشکی و کوێریش بوو .

کەهاتمە سەری بەپەلە دەستی چەپیم گرت تا دەمارێکی بدۆزمەوە و کانیۆلاکەی بۆ دابنێم ، کەچی وتی: ئەوەکێ یە ؟ وتم : دکتۆر خالید جوبەیر ، وتی : چی دەکەیت ؟ وتم : کانیۆلات بۆ دادەنێم . وتی : من مردووم بۆم دامەنێ ، وتم : نا تۆ زیندوویت و نەمردوویت ، چەند جارێك هەوڵم دا دەمارێکی بۆ بدۆزمەوە بۆم نەکرا، ئەو دەیوت : من مردووم و منیش دەموت : تۆ زیندویت و نەمردوویت ، تا دواجار وتی : ئەڵیم خۆت ئەزیەت مەدە من مردووم و مەلائیکەتی عەزاب دەبینم .

هەموو مووەکانی لەشم ڕاست بوونەوە ، دەستم شل بوو ، چۆن لەو ژوورەدا لەنهۆمی دووەمی خەستەخانەی سەربازی ریاض ئێستە مەلائیکەتی عەزابی لێ یە ، زۆر ترسام هەروەك منالێکی سێ ساڵان کە گەورەیەك لەژوورێکدا بەتەنها بیترسێنێت .

ئەترسام ئێستا یا تۆزێکی تر مەلائیکەتەکانی عەزاب منیش بگرن ، کابرا پاش تۆزێك بەم حاڵەوە مرد .

**دووەم/** ڕۆژێك لەعەمەلیات بووم پێیان ڕاگەیاندم کە لاوێك فیشەکێك بەرملی کەوتووە و حاڵی خراپە و دەمرێت ، منیش وتم خوێنی بۆ بهێنن و ئێستا دێم ، کەهاتم بینیم دەموچاوی گەشە و لەهۆش خۆی چووبوو ، ملی ئاوسابوو ، فەحسم کرد تابزانم چی بۆبکەم ، کوڕە هاتەوە هۆش خۆی و وتی : دکتۆر عەزیەتی خۆت مەدە من دەمرم ، من لەخێردام ، من شوێنی خۆم دەبینم لەبەهەشتا ، ئەمەوێ خوا حافیزی لەدایك و باوکم بکەم .

چووم دایك و باوکیم بانگ کرد ، وتیان : چۆنە؟ وتم : باش دەبێت إن شاءالله کوڕەکەتان لەخێردایە ، کە باوك و دایکی چوونە لایەوە چاوم لێ بوو دەستی دایکی ماچ کردو وتی : گەردنم ئازاد بکە ، ئنجا دەستی باوکی ماچ کرد و وتی : گەردنم ئازادبکە ، ئنجا دەستی هەردوکیانی خستە سەر سنگی و وتی:دوعام بۆبکەن ، شایەتمانی هێنا و گیانی دەرچوو .

## گەشتی ژیان

دوایی لەدایك و باوکەکەم پرسی کوڕەکەتان چۆن بووە ، وا شکور عاقیبەت خێرە ؟ وتیان : لەپۆلی دووی سانەوی یەکەم بوو ، شەونوێژی دەکرد و ئامادەی ئەڵقەکانی لەبەرکردنی قورئان دەبوو .

بەڕاستی ئەمە تەصدیقی ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەرە (د.خ) کە دەفەرموێت : کاتێ یەکێکتان لەسەرەمەرگدایە و ڕوو لەقیامەت و پشت لەدنیا ، چەند چاوی بڕیکات مەلائیکەتی ڕەحمەتی ڕووسپی دەبینێت و جێگاکەی خۆی دەبینێت لەبەهەشتا .

**سێ یەم/** تەغریدی کچم لەلەندەن کوڕێکی بوو ناوی نا (خالید) بەناوی منەوە ، چووم بۆ سەردانیان ، وتم : مزگەوت نزیکە ؟ وتی : خەمت نەبێت ئەوە مەرکەزی ئیسلامیە چەند خولەکێك لێمانەوە دوورە ، بۆ نوێژەکان دەچووم بۆ ئەومەرکەزە و گەنجێکم بینی پێنج فەرزە ئامادەی نوێژکردن دەبوو ، بەزمانی ئینگلیزی داوای لێکردم دوعا بۆدایك و باوکی بکەم ، وتم : بۆ دایك و باوکت کافرن ؟ وتی : نەخێر ، بەناو موسڵمانن وچل ساڵە هاتوونەتە لەندەن نەئەوان و نە خوشك و براکانم هیچیان نوێژناکەن ، وتم : ئەی تۆ چۆنە نوێژدەکەیت ؟

وتی : منیش وەك ئەوان بووم ، ڕۆژێك وتم : باشە ئەگەر من موسڵمانم نابێ ئیسلامەتیەکەم پێوە دیاربێ؟! نوێژی عەسرێك هاتم بۆ مەرکەزی ئیسلامی ، دوای نوێژەکە بەیەکێکیانم وت : دەمەوێت فێری دەست نوێژ و نوێژم بکەیت ، وتی : موسڵمانیت ؟ وتم : بەڵێ ، وتی : عەمرت نەمێنێ بەو قەڵافەتەوە چۆن نوێژناکەی بڕۆ دەرەوە ، بەڕاستی زۆر دڵم شکا و شەیتانیش هانی ئەدام و ئەیوت : دەی کە ئەم موسڵمانانە وابن چیت داوە لە نوێژ و ئیسلامەتی ، تۆ گەنجیت بۆخۆت چیت پێخۆشە بیکە ، بەقسەی شەیتانم نەکرد دوای سێ ڕۆژ چوومەوە لەدوای نوێژی ئێوارە بەیەکێکم وت :تکایە فێری نوێژ و دەست نوێژم بکە ، ئەمیان باش بوو فێری کردم.

وتم : ماڵتان نزیکە ؟ وتی : نەخێر بۆ هەموو فەرزێك بە ٤٥خولەك دەگەمە ئێرە و بەیانیانیش پێش سەعات و چارەکێك دێم ، حەز دەکەم ماندوو ببم بۆ نوێژەکەم . چونکە خوای گەورە داوای لێکردووین دروشمەکانی بەرز ڕابگرین ﴿وَمَنْ يُعَظِّمْ شَعَائِرَ اللَّهِ فَإِنَّهَا مِنْ تَقْوَى الْقُلُوبِ (٣٢)الحج﴾ ڕاستە جاری واهەیە پلەی گەرما دە بۆ بیست پلە دێتە ژێر سفرەوە بەڵام بۆخوایە هاتنەکەم ، من ئەم کراسەم بۆ جەژن کڕی وگریام لەبەرئەوەی لەبەر بەرزڕاگرتنی جەژن

لەبەرم کرد ، وتم : چۆن ئاوا لەقورئان تێگەیشتوویت ؟ وتی : بۆ تۆ وا ئەزانیت هەرچی عەرەبی چاك نەزانێت تێی ناگات ؟! ئەوەی دڵێکی پاك و چاکی هەبێت لە قورئان تێدەگات .

بەڕاستی زۆر بۆ حاڵی خۆم گریام ، ئەم لاوە خۆی بەدوای ئیسلامدا گەڕاوە و بیست و پێنج لاوی تری وەك خۆی هێنابوو بەرەو مزگەوت و وتی :لەکۆلێژی پزیشکی دەخوێنم و گروپێکمان دروست کردووە تاببینە مایەی هیدایەت بۆ کەسانەی تر ، حەزدەکەم کە بانگخوازی بێ دەنگ بین و خەڵك بەهەڵسوکەوتماندا بزانێت کە موسڵمانین ، هەروەك چۆن : خەڵکی ئیندۆنیسیا و فلیپین بەڕەوشت و خووی بەرزی بازرگانە موسڵمانەکان هاتن بەرەو ئیسلام .

**چوارەم/** لەگەڵ شێخێکی بانگخوازدا دەرچووین بۆ کاری بانگخوازی ، لەڕێگا بەلای بەندیخانەی گشتیدا ڕۆشتین ، وتی : من لەو کۆلێژە دەرچووم ، قسەکەیم لا سەیربوو کۆلێژی چی ئەوە بەندیخانەیە .لێم پرسی مەبەستت چی یە ؟

وتی : شانزە ساڵ خەریکی چەتەیی و دزیی بووم ، کەگیرام شەش ساڵ حوکم درام لەگەڵ سێ هەزار قامچی دا و هەفتەی پەنجا قامچیان لێ ئەدام . سەری دنیام لێ هاتەوە یەك ، یەکێك کەپێش من

گیرابوو ،هەستی کرد کە بێتاقەتم وتی : ئەتەوێ حوکمەکەت ببێ بە سێ ساڵ ، وتم : ئەرێ واللە حەزدەکەم بەس چۆن ؟ قورئانێکی دایە دەستم ، وتی : ئەمە لەبەربکە ، وتم : جا ئەوە شەش سەد لاپەڕەیە بەچی لەبەردەکرێت ؟

وتی : تۆ زیرەکیت شانزە ساڵە حکومەتت سەرقاڵ کردووە و مێشکت لەخراپەدا بەکارهێناوە ئێستا لەچاکەدا بەکاری بهێنە ، وتم : ئاخر من نوێژناکەم ، وتی : قەیناکە ، ناچار کەوتمە لەبەرکردن و دەچوومە مزگەوتی بەندیخانەکە و لەکاتی نوێژەکاندا ئەهاتمە دەرەوە ، تاگەیشتمە سورەتی الأعراف ، ئەوئایەتانەی باسی دۆزەخ دەکەن و باسی بەهەشت دەکەن ژیانمیان گۆڕی ، جارێك کەقامچیان لێ ئەدام ، پۆلیسەکە پرسی : مانگێکە ڕەنگ و ڕووت گۆڕاوە ، وتم : بەڕاستی من لەخۆشیەکدام دەڵێم ئاخۆ ئەوانەی دەچنە فیردەوسی ئەعلاوە تۆبڵێی لەو خۆشی یەی منداب ؟!

پاش ئەوەی کە بەربووم لەسایەی خواوە ڕێی خوام گرتووە و خەریکی بانگەوازم بۆ پەیامەکەی خوا ،جابەڕاستی ئەو بەندیخانەیە کۆلێژبوو بۆمن.

# گەشتی ژیان

**پێنجەم/** پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێت : (إن للمساجد أوتادا ، الملائكة جلساؤهم ، إن غابوا يفتقدونهم ، وإن مرضوا عادوهم ، وإن كانوا فى حاجة أعانوهم ، ثم قال : جليس مسجد على ثلاث خصال : أخ مستفاد ، أو كلمة حكمة ، أو رحمة منتظرة) أبوهريرة/المحدث الألباني/ المصدرصحيح الترغيب/الصفحة ٣٢٩/حسن صحيح .

نزیکەی پانزە ساڵ لەمەوبەر نەشتەرگەریم کرد بۆ گۆڕینی (صمام) ی دڵی کەسێك نەشتەرگەرییەکە چوار سەعات تا شەش سەعاتی دەوێت ، بەیانی کەهاتم بۆ ژووری عەمەلیات ئەتووت لەڕەوزەی شەریفم و زۆر هەستم بەخۆشی و سەکینەت دەکرد ، کەهاتمە لای موخەدیرەکە ئەویش هەمان هەستی هەبوو ، وتی : زۆر هەست بەدڵنیایی و ئارامی دەکەم و بە ١٠خولەك تەخدیرەکەم کرد ، منیش وتم : ڕەنگە هی ئەوەبێت کە هەردووکمان نوێژی بەیانیمان لەمزگەوت کردووە ، کەچی ئەوەی سەیربوو پەرستارێکی بەریتانیش لەبەردەستما بوو پێداویستییەکانی نەشتەرگەریەکەی ئامادە دەکرد لەگەڵ ئەوەشدا کە موسڵمان نەبوو هەمان هەستی هەبوو ، وتی : کە زۆر بەئاسانی کارەکان هاتوون بەدەستیەوە .

زۆرم پێ سەیربوو ، کە نەشتەرگەرییەکەشم کرد تەنها دوو سەعات و چارەکێکم پێ چوو کە خۆی دەبوایە بەلای کەمەوە چوار تا شەش سەعاتم پێ بچوایە ! دوایی تێگەیشتم کە ئەم نەخۆشە ئەهلی مزگەوتە و کاتێ وا نەخۆش کەوتووە و لەمزگەوت دیار نیە بەپێی فەرمودەکە مەلائیکەتەکان هاتوون بۆلای و دیارە کە مەلائیکەتەکانیش دابەزیون سەکینەت و ئارامی و خۆشی لەو شوێنەدا بلاوبۆتەوە کە هەرسێکمان هەستمان پێ کرد .

جارێکی تریش ئافرەتێکی خواناس کە نەشتەرگەریم بۆکرد هەمان شت دووبارە بۆوە ، مەلائیکەتان بەبڕواداران دەڵێن (نَحْنُ أَوْلِيَاؤُكُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الْآخِرَةِ) فصلت ٣١.

**شەشەم/** پیاوێك ئەناسم فەڕاشی قوتابخانە بوو ، خۆی و ژنەکەی و دایك وباوکی و سیانزە منداڵ لەژوورێکدا دەژیان لە قوتابخانەکەدا ، لەگەڵ ئەوەی کە زۆر هەژاربوو ، هەمیشە لەڕیزی یەکەمی نوێژ ئامادە دەبوو ، زۆرجار دەوڵەمەندەکانی مزگەوت هاوکارییان دەکرد ، ئەم پیاوە هەمیشە دیاربوو کەبەختەوەرە بەوحاڵەشەوە .

کەچی دەوڵەمەندێکم بینی لەخەستەخانە کەتەمەنی شەست ساڵێك دەبوو کەیەکێکە لە ١٠ دەوڵەمەندەکەی ریاض هاتبوو

نەشتەرگەری بۆبکەم ، پێی وتم : کە حەوت ساڵە بەدوای سەعادەت دا دەگەڕێت و شەوانە لەبەر نائارامی بە حەبی خەو دەخەوێت .

یەکێکی تریشم لەفڕۆکەخانە بینی کە ئەویش یەکێکە لە ١٠ دەوڵەمەندەکەی سعودیە ، لەسەر عارەبانەی کەمئەندامەکان بوو ، یەك ملیار دۆلار بەس پارەی کاشی هەبوو لەبانقەکاندا ، کەچی سەمونێك و بوتڵێ ئاوی بەدەستەوە بوو وتم : ئەوەچی یە ؟ وتیان : بەیانیان ئەبێت سەمون و ئاو بخوات و پارێز بکات .

**حەوتەم/** برادەرێك دەناسم لەدوکانی کەلوپەلی ئافرەتان کاری دەکرد و دەمزانی سەیری ئافرەتان دەکات ، ئامۆژگاریم کرد کەهەر جارێك چاوی برپە ئافرەت ، دوو ڕکات نوێژبکات ، دوای ماوەیەك پەیوەندی پێوە کردم و وتی : ئێستا شەیتان نایەڵێ سەیری ئافرەت بکەم چونکە ئەزانێ کە سەیری بکەم دووڕکات نوێژدەکەم و ئیستیغفار دەکەم،جا کەئەوەشی پێناخۆشە هانم نادات بۆ سەیرکردنی ئافرەتان.

هەشتەم: ڕۆژێك گەنجێکی ١٦ ساڵی خواناس لەمزگەوت جەڵتە لێی داو بەپەلە هێنایان بۆ بەشی فریاکەوتنی خێرای خەستەخانە،زۆر هەوڵمان لەگەڵدا، دکتۆری موقیمی بە دیارەوە بوو منیش شپرزەبووم و خەریکی ئەوەبووم بە هەندێ ئامێری تر فریای بکەوین،چوومە

دەرەوەو خێراهاتمەوە بینیم دەستی موقیمەکەی گرتووەو شتێکی پێووت و رووی کرد بەلای راستداو بەهەزارحاڵ شایەتمانی دووبارە دەکردەوەو لەپڕ دەستی دکتۆرەکەی بەرداو دواهەناسەی داو وەفاتی کرد.

دکتۆرەکە زۆر بەکوڵ گریاو ئەژنۆی شل بوو ناچار دانیشت،لامان سەیربوو ! وتمان : خۆ ئەمە یەکەم جارت نیە لەم حاڵەتانە ببینی بۆ وادەکەی؟ بەدەم گریانەوە وتی : دکتۆر خالید کەتۆی دی ئاوا شپرزیت و ئەتەویٚ هەرچۆنێك بێ فریای بکەویت،پێی وتم : بەدکتۆر بڵێ : باخۆی ئەزیەت نەدات من ئەمرم،وا جێگاکەی خۆم ئەبینم لە بەهەشتا !

**نۆیەم : ئێمەو قورئان :**

یەکەم :خوای گەورە دەفەرموێت : گوێبگرن بەچاکی لەقورئان و بێدەنگ بن بۆ ئەوەی خوارەحمتان پێبکات ( قُلْ إِنَّمَا أَتَّبِعُ مَا يُوحَى إِلَيَّ مِنْ رَبِّي هَذَا بَصَائِرُ مِنْ رَبِّكُمْ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ (٢٠٣) وَإِذَا قُرِئَ الْقُرْآنُ فَاسْتَمِعُوا لَهُ وَأَنْصِتُوا لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ (٢٠٤)الاعراف ..

# گەشتی ژیان

قورئان هیدایەتەو مایەی رەحمەتەو مایەی شیفایە (يَا أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ جَاءَتْكُمْ مَوْعِظَةٌ مِنْ رَبِّكُمْ وَشِفَاءٌ لِمَا فِي الصُّدُورِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِلْمُؤْمِنِينَ (٥٧)یونس

وَنُنَزِّلُ مِنَ الْقُرْآنِ مَا هُوَ شِفَاءٌ وَرَحْمَةٌ لِلْمُؤْمِنِينَ وَلَا يَزِيدُ الظَّالِمِينَ إِلَّا خَسَارًا (٨٢)الاسراء

ئێمە وەك پێویست وردنابینەوە لەقورئان و ئنجا وەك شیفاش بەكاری ناهێنین ، كەدیارە لەگەڵ بەكارهێنانی دەرماندا ئەبێت شیفای قورئانیشمان بیر نەچێت .

هەژدەسەعات خەریكی نەشتەرگەری دڵی منداڵێك بووین لە بەیانیەوە تا سەعات دووی شەو ، هەرچیمان كرد لێدانی دڵی و گەرمی لەشی نزم بوون و ناچار وتم ئەگەر دڵی وەستا وازی لێبێنن .كەبەجێم هێشت ، لەوسەری قاوشەكە ژنێك بەدیار كچەكەیەوە بوو كەمنی بینی وتی: دكتۆر كچەكەم خەوی لێناكەوێت بۆ هەندێ دوعای بەسەرا ناخوێنی ، ئەمە رایچڵەكانم و زانیم كە من دوعام لەیادچووبوو، خێرا گەڕامەوە سەر منداڵەكەو دەستی راستم لەسەری داناو دوعام بۆكردوسێ جار وتم:(اللهم رب الناس اذهب البأس ، اللهم اشفی أنت الشافی لاشفاء الا شفاؤك ، شفاء لایغادر سقما ).

خوا شایەتە سەعات ٧ی بەیانی باشتر بوو ، سەعات ٩ تەواو لێدانی دڵی و گەرمی لەشی بەرزبۆوە.

شایانی باسە لە ساڵی ١٩٩٠ ەوە لەجۆرج واشنتۆن لە ئەمەریکا پەیمانگایەك دامەزراوە بۆدیراسەی کاریگەری ئیمان لەسەر چاکبوونەوەو چەندەها لێکۆڵینەوە لەوبارەیەوە کراوە و لە زانکۆی هارفاردیش پێی دەڵێن (هۆکاری ئیمانی لەسەر چاکبوونەوە) کەجارانیش هەستیان پێدەکردو ناویان دەبرد بە هۆکاری نەزانراو بۆ چاکبوونەوە .

دووەم : وَإِذْ نَجَّيْنَاكُمْ مِنْ آلِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوءَ الْعَذَابِ يُذَبِّحُونَ أَبْنَاءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَاءَكُمْ وَفِي ذَلِكُمْ بَلَاءٌ مِنْ رَبِّكُمْ عَظِيمٌ (٤٩)البقرة .ئەم ئایەتە سی ساڵ من بەهەڵە تێی گەیشتبووم وەمزانی (يستحيون نساءهم) واتە (يستبيحون نساءهم) لەکاتێکدا ماناکەی وانیە . تا کەسێك ماڵی ئاوا بێت بۆی راستکردمەوە .

ئێمە خواخوامانە زوو ویردی رۆژانەکەمان بخوێنین ، ئەگەر بیخوێنین و ئیتر کەمتر لا دەکەینەوە بەلای تەدەبووری قورئاندا لەکاتێکدا کەخوا داوای لێکردوین تەدەبوری قورئان بکەین بە دوای ماناو مەبەستەکانیدا بگەڕێین ( أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ أَمْ عَلَى قُلُوبٍ أَقْفَالُهَا (٢٤)محمد.

سێیەم :پزیشکێکی هیندۆسی بوزی دووهەفتە پێش ڕەمەزان موسڵمان بووبوو ، لەرەمەزاندا لەلایەوە بووم لە نوێژدا ، ئیمامەکە کۆتایی سوورەتی زومەری خوێند، کەسەلامی دایەوە فرمێسك بەچاویەوە بوو ، وتی : ئەوە چ ئایەتێك بوو خوێندی و لە چ سورەتێکدابوو ؟ زۆر تەریق بوومەوە لە حاڵی خۆم کەمن حافزی قورئانیشم و بەهێندەی ئەو کاری تێنەکردم .

**موسلمانێکی مرۆڤ دۆست :**



# گەشتی ژیان




جۆرج گالەوی لەساڵی ١٩٥٤ لەدایكبووە ،لە ئۆسكۆتلەندەو لە ١٥ ساڵیەوە كاری سیاسی كردووە و لەساڵی ١٩٨٠دا بووبە ئەمینداری لقی حیزبی عومال لە داندی .

ساڵی ١٩٨٧ تا ٢٠١٠ ئەندام پەرلەمان بووە . هەوڵی داوە ئابلۆقەی سەر عێراق لابرێ و لایەنگری مەسەلەی فەلەستینیەو كەسێكی موسڵمانە .

كاتێك ئابلۆقەی غەززە درابوو منالّ وپیرو پەككەوتە چاوەڕێی رەحمی خواو هیممەتی خێرخوازان بوون ، جوولەكە تۆپبارانی دەكردن و نامووبارەكیش مەعبەری رەفەحی داخستبوو، عەرەبیش بەرووكەش ئیستنكاریان دەكردو بەدڵ ئاواتی لەناوچوونی غەزەیان دەخواست .

## گەشتی ژیان

ئالەم کاتەدا کەسایەتی بەریتانی مرۆڤ دۆست جۆرج گالاوی ساڵی ٢٠١٠ کاروانی (الشریان) ی لەگەڵ پەرلەمانتاری تورکدا سازکردو لەتورکیاوە هاتنە ئەردەن و سوریاو لە عەقەبە ئەمنی میسری بەرەو روویان بوونەوە و گێڕایاننەوەو، ناچارچوونە ئەردەن و پاشان لازقیەو بەدەریادا چوونە عەریش و لەمینای عەریشیش ئەمنی میسری زۆر ئازاریان دان و سەرەنجام لەمەعبەری رەفەحەوە داخلّ بوون.ئەم مەسافەیەش کە ١٨٠٠ کیلۆمەتر بوو نیو ملیۆن دۆلار کەوت لەسەریان ،کەگەیشتن پێشوازیەکی گەورەیان لێکرا.

کەناڵی جەزیرە چاوپێکەوتنی لەگەڵ کردو وەرگێڕ لەبەرگریان نەیدەتوانی قسەکانی وەرگێڕێت بۆ زمانی عەرەبی کەهەموو سەرانی عەرەبی رووزەردو ریسواکرد .

جۆرج وتی: من پیربووم رەنگە نەگەمە ئازادبوونی فەلەستین ، تەنها ئاواتم ئەوەیە کەزەین الدین ی کوڕم (کە ئێستا تەمەنی دوساڵ ونیوە) لە گەڵتاندا بێتە ناو فەلەستینی ئازادەوەو ئێوەش دەستیٚ بدەن بەشانیاو بڵێن : جۆرجی باوکت لەناومانا بوو ،لەسەر هەمان رێگا لەگەڵمان بوو،وا گەیشتین ئەی زەینەدین .

ئنجا هەناسەیەکی هەڵکێشاو وتی: ئەگەر زەینەدینیش گەورەبوو من مابووم و گلەیی لێکردم و وتی: باوکە تۆ لەو زەمانەدا ژیایت

## گەشتی ژیان

کەهەموو دنیا تەماشاکەری منالأنی غەززەبوون کە دەخنکێنران ، چۆن هیچتان بۆنەکردن ، ئایا عالەم شەرمەزارنەبوون؟ پێی دەڵێم : کوڕم خوا دەزانێت تا دوا هەناسە چیم لەتوانادابوو کردم لە پێناویاندا .. سا بەڵکو کوڕەکەم لێم ببورێت ..

### دکتۆر ئیبراهیم ئەلفەقی:

ساڵی ١٩٥٠ لە ئەسکەندەریە لەدایکبووە بە حەوت مانگی ،کاتێك هات چاوەڕێی هاتنی نەبوون و کاتێکیش لە ٦٢ ساڵیدا لە ٢٠١٢مرد کەس چاوەڕێی مردنی نەبوو،زۆر چالاك و بەتوانابوو لە زۆربەی ولأتانی دونیادا وتاری دەدا و خەڵکی پێویستیان پێی بوو.هەروەك سەعیدی کوڕی جوبەیر کە کاتێك شەهیدکرا خەڵکی دەیانووت: سەعید لەکاتێکدا مرد کەهەرچی لەسەر زەویدایە پێویستیان بە زانستەکەی بوو.

لەشەش ساڵیدا ئەوەندە هاروهاج بوو ئەچووە سەر شەقام و پەنجا ئوتومبێلی لێبوایە تایەی هەموویانی فش دەکردەوە کە دەکاتە دووسەد تایە.

هەر لە منالّیەوە حەزی لە پێشبڕکێ بووەو لە تافی لاویدا لە تێنسی سەرمێزدا یەکەم بووە.

# گەشتی ژیان

رەحمەتی حەزی دەکرد ببێتە بەڕێوەبەری گەورەترین ئوتێلی جیهان و هەروەها یەکەمی یاری تێنسی میسری.بۆ ئەمەش رۆژی شەش کاژێر مەشقی دەکردو هەوڵیشی دەدا فێری زمانی ئینگلیزی و فەڕەنسی و ئەڵمانی ببێت .

ئنجا ژنی هێناو لەتەمەنی ٢٣ ساڵیدا چوو بۆ کەنەداوتەنها هەزار دۆلاری پێبوو،کە لە فرۆکەخانەی هۆڵەندا بە ترانزێت دابەزین و سەعاتی بۆ خۆی و ژنەکەی کڕی ،ژنەکەی وتی: پارەکەمان پێبێت باشترە ، وتی: نەخێر با ئیعتیمادمان لەسەر پارەکە نەبێت و زوو بگەڕێم بەدوای ئیشدا.

هەر گەیشتنە کەنەدا لە ٤٨ کاژێردا دوو کاری دۆزیەوە کە باشترینیان قاپ شتن بوو لە چێشتخانەیەکدا، لەگەڵ ئەوەدا کە سێ دبلۆمی هەبوو لە بەڕێوەبردنی ئوتێلداو سێ زمانیشی دەزانی.

پاش ساڵێك کارکردن بێزاربوو وازی هێنا چونکە عەرەب بوو بەچاوێکی تر سەیریان دەکردوتەقدیری کارومانددووبوون و چالاکیان نەدەکرد .

## گەشتی ژیان

ڕەحمەتی دەڵێت بەشەقامدا ئەڕۆیشتم بیرم دەکردەوە ، هاوسەرەکەم بە عەمەلیات دووکچی بووە، من بێ ئیش و بێ کار چۆن ئەو سیانە لەو وڵاتی غەریبیە بەخێو بکەم .

لەوکاتەدا فەرمایشتەکەی باوکم هاتە گوێم کە دەیووت :ئاوڕ بۆ دواوە مەدەرەوە خوا دەرگایەك ناگرێت تا دەرگایەکی گەورەتر نەکاتەوە .ئالەو ساتەی نائومێدیەدا بڕیارمدا ببمە بەڕێوەبەری گەورەترین ئوتێل لە شەش ساڵدا بەمەش گەشتی ئیدارەم دەستی پێکرد.

پاش ئەوەی بەشەو بوومە پاسەوان و بەرۆژیش لە ئوتێلێکدا مێزوکوریسیم ئەگواستەوە لەهەمان کاتیشدا لە زانکۆی کۆنکۆردیا لەکەنەدا بەشی کارگێڕیم دەخوێند.پاش شەش ساڵەکە و پاش چەند جار دەرکردن و بێ ئیش بوون بوومە بەڕێوەبەرو لە ساڵی ١٩٩٠ دا خەڵاتی باشترین بەڕێوەبەرم وەرگرت لە ئەمەریکای باکورو ڕۆژنامەو گۆڤارەکان لەسەریان نووسیم .

کەوتمە دامەزراندنی دەزگای گەورەو قوتابخانەی زمانی عەرەبی و مزگەوت هەمووی لە صفرەوە دەستم پێدەکرد .

ئەوپارانەی هەم بوو لەگەڵ دوو شەریکی تردا لەئوتێلێکی گەورەدا خستمە کارەوە و بەبێ ئاگالێبوونی من کارێکیان کرد ئیفلاسم کرد ، هەروەك خوا بیەوێت واز لەو بوارە بهێنم ، لەسفرەوە دەستم پێکردەوەو کەوتمە مەشق کردن بەخەڵکی لەبواری کاری ئوتێلداو مەشقم بە ١٨٠٠٠ کەس کردو یەکەم پەڕاوم نووسی و لەیەك مانگدا سەد هەزار دۆلارم دەستکەوت.

زۆر کۆمپانیای گەورە داوایان لێدەکردم کاربکەم لەلایان ، من ٢٣ دبلۆم و سێ ماستەرلە بواری دەروونناسی و گەشەپێدانی مرۆیی و تەسویق و...هتد دا.و دکتۆرایەکیشم هێنا لە بواری (ماوراء الطبیعة)دا .وەدامەزرێنەری دوو زانستی تازەبووم بەناوی(علم قوة الطاقة البشرية وعلم ديناميكية التكيف العصبي ) .

ناوبراو دەوراتی وتۆتەوە تەدریبی کردووە بە شەش سەد هەزارکەس و سێصەد کۆمپانیا لەو پێنج صەد کۆمپانیا گەورەیەی کە لە جیهاندا هەن .

پاش سی ساڵ لە کەنەداو ئەمەریکا گەڕایەوە میسر، شارەزایەکی بیانی کەدەهات لەبواری گەشەپێدانی مرۆییدا خولی دەکردەوە زۆر گران بوو ، بەشدابوویەك دەبوایە بیست هەزار جونەیهی میسری بدایە

، دکتۆر ئیبراهیم توانی هەرزانی بکات بەجۆرێك کەهەموو کەس بتوانێت بەشداربێت و تەنها سەد جونەیهیش بدات.

**دکتۆری خواناس :**

دکتۆر زۆردیندار بوو ، زۆر هاوکاری هەژارانی دەکردو لەگەڵ ئەوەشدا کەپشتی دەیەشا شەونوێژی وازلێنەدەهێناو دەیووت : کەگەڕامەوە بەربارەگای خوا دەڵێم: خوایە من بەئازاری پشتەوە شەونوێژم دەکرد . مەگەرخوا داوای لێنەکردوین کەلە باشترین شتمان بەخشین منیش لە تەندروستی خۆم دەبەخشم

(لَنْ تَنَالُوا الْبِرَّ حَتَّى تُنْفِقُوا مِمَّا تُحِبُّونَ وَمَا تُنْفِقُوا مِنْ شَيْءٍ فَإِنَّ اللَّهَ بِهِ عَلِيمٌ (٩٢)آل عمران .

**دیاری خوا :**

١-رەحمەتی لە وتارێکدا باسی ئەزموونێکی خۆی دەکات و دەڵێت: تووشی سەریەشەیك بووم خەریك بوو لەتاو ئازار سەری خۆم بدەم بەداروبەردا ، سی ساڵ لە کەنەدا بووم ، چوومە لای پزیشك ، ئەویش بەبێ پشکنین لەکۆڵ خۆی کردمەوەو حەبی ئازاری بۆ نووسیم ، بەمەرجێ لەو ولاتە هەر پزیشکێ بێ پشکنینی تەواو دەنکێ حەب بۆکەسێ بنووسێت بڕوانامەکەی لێدەسێنرێتەوە ؟!.

# گەشتی ژیان

چوومە لای پزیشکێکی ترو پشکنینی تەواوی بۆکردم و ئەشیعەی سیتی سکانی بۆگرتم ودەرکەوت کە جەڵتەی دەماخم تووش بووەو حاڵەتەکەم زۆر مەترسیدارە و بیست وچوار سەعاتیان بۆدانام، شەش رۆژ لە ژووری چاودێریدا مامەوەو زۆر بێاقەت بووم کە نە ئەبوایە لەشوێنی خۆم بجوڵێم و دەیانووت هەرچی بێتە ئێرەو وەك تۆ بێت یان بەمردوویی یان بە ئیفلیجی دەچێتە دەرەوە.

لە خەستەخانە کاتژمێر یانزەونیوی شەو منداڵێکی حەوت ساڵان هات بۆلام کە وەرەم لەسەریدا هەبوو ،کە بەوحاڵەوە بینیمی وتی : بێتاقەتی ؟ وتم : برۆ مەگەر ئەی من بۆ لێرەم ؟

وتی :پێویستە تۆ دیاری وەربگریت؟؟

وتم : دیاری چی ؟؟

وتی :دیاری خوایی ،ئەوەتا من تووشی شێرپەنجەی دەماخ بووم و سبەینێش نەشتەرگەریم بۆ دەکرێت و رێژەی سەرکەوتنی نەشتەرگەریەکەش لەسەدا یەکەو، زۆر دڵخۆشم بەدیارییەکەی خوا.

ئەم قسانەی ئەو منداڵە نامەیەك بووخوا بۆی ناردم ، تەزوویەکی هێنا بەگیانما لە تەوقەسەرمەوە تابنی پێم ،هەرچەندە بۆ سبەینێ ئەو مرد ، بەڵام وانەیەکی گەورەی دا بەمن و بە هەزارانی وەك من ، بەخۆمدا چوومەوەو زۆر لە خوا پاڕامەوەو وتم : خوایە هەرچی موعجیزاتە لە تۆوەیەو چیت بوێت ئەتوانی بە (کن فیکون) بیکەیت ، داوای لوتف و بەزەیی تۆ دەکەم ،بەڕاستی پشتم بەخوا بەست و بەهیواوهیممەتێکی

نوێوە سەیری نەخۆشیەکەمم کرد ،دوای تەنها دە خولەك وتم : ئەو ڕۆبەم بدەنێ ئەچم دەستنوێژ دەشۆم .

دکتۆر وتی : دەستنوێژی چی ؟ تۆ حاڵت خەتەرەو نابێ بجوڵیی ئەگینا دەمریت .وتم : ئەی بۆ تۆ نامریت ؟؟

دەستنوێژم شت و بەڕاستی ڕوومکردە خوا ،خوای گەورەش شیفای دام وئەو پەڵە خوێنەی لەسەرما بوو لە دوو سانتیمەترەوە بوو بە نیو سانتیمەتر . دواتر ئەم بەسەرهاتەم کرد بە کتێبێك و ناوم نا خۆشترین شەش ڕۆژ لە ژیانمدا .

ڕاستە ئێمە ئەچینە لای دکتۆرو دەرمان بۆ چارەسەر بەڵام نابێت بیرمان بچێت کە شیفا لای خوایە(وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ ) الشعراء۸۰.

برادەرێکم شێرپەنجەی مێشکی بوو پێیان وت : شەش مانگی تر دەمریت ، کەچی بیست و چوار ساڵ ژیاو بە ڕووداوی ئوتۆمبیل گیانی لەدەستدا .

٢- لە گەشتێکمدا بۆ وڵاتێکی عەرەبی جانتاکەم لە فڕۆکەخانە نەگەیشتبوو ، جلەکانم پێنەبوو بۆ بەیانیش لە زانکۆیەك وتارم هەبوو ، بەڕوویەکی گرژومۆنەوە هاتمە دەرەوەو پیرێژنێك بەوحاڵەوە بینیمی و وتی : تۆ دکتۆر ئیبراهیم نیت ؟؟ وتم : بەڵێ ئەوم .

وتی: تۆش جانتاکانت نەگەیشتووە ؟؟ وتم :بەڵێ . وتی: کەواتە دیاریەکە وەردەگریت ؟؟

یەکسەر زانیم کەئەوە نامەیەکی خواییەو بەو ژنەدا بۆی ناردم ئەو قسانەی بیرخستمەوە کە خۆم لە وتارەکانمدا بەخەڵکم دەووت .

ئنجا ژنەکە وتی: سوپاسی خوا بکە جانتاکانت بگەیشتایەو خۆت نەگەیشتیتایە چۆن دەبوو !!

بەڕاستی دواکەوتنی فڕۆکەوجانتاو چاوەڕوانی لە فڕۆکەخانەکاندا ئاساییەو زۆر ڕوونەدات ، بۆیە زۆر لە کتێبەکانم لەو کاتانەدا نووسیومن چونکە کەس تەلەفونت بۆ ناکات و سەرقاڵ نابیت .

**متمانە بەخۆبوون:**

ڕەحمەتی زۆر متمانەی بەتواناکانی خۆی بوو بۆیە ڕۆژێك بە بەڕێوەبەرەکەی خۆی وت، دوو هەواڵت دەدەمێ ، یەکێکیان خۆش و ئەوی تریشیان ناخۆش ، خۆشەکەیان ئەوەیە کەمن هەنگاو بەهەنگاو سەردەکەوم تادەبم بەڕێوەبەر ، دووەمیشیان کەناخۆشەکەیە ئەوەیە کەدێمە شوێنەکەی تۆ ، بەڕێوەبەرەکە سەرسام بوو لەو هەموو متمانە بەخۆبوونە لەوڵاتی غەریبیدا .

ڕەحمەتی موستەحیلی لانەبوو ، دەیووت : مادام گیانت تیایەو هەناسە ئەدەیت خوا داوات لێدەکات پەیمانداربیت و پەیامەکەت بگەیەنیت .

هەروەها دەیووت : من پەشیمان نیم لەکارەکانم و بەخێرایی کارەکانم هەڵدەسەنگێنم وئەگەر ناتەواویەکم هەبێ بەوپەڕی خشوعەوە داوای لێبوردن دەکەم لەخواو بەخێرایی هەوڵی گۆڕینی دەدەم.

**وەڵام :** لەوەڵامی ئەوەدا کە لەم وڵاتانەی خۆمان سەرکەوتن زەحمەتە ، دکتۆر ئیبراهیم دەڵێت : وانیەو دەتوانرێت لەم وڵاتانەی خۆشماندا هەوڵ بدەیت و سەرکەوتن بەدەست بهێنیت ، بۆنموونە :

جەماله بیضانی لەیەمەن : لەدایکبووی ساڵی ١٩٧٤ەو کەم ئەندام بوو کورسی کەمئەندامانی بەکاردەهێناو تەنها ٣٨ ساڵ ژیاو لە ٢٠١٢ کۆچی دوایی کرد .ئەم ئافرەتە کەم ئەندامە دبلۆمی هێنا لەپەروەردەی تایبەتداو هەموو ژیانی تەرخان کرد بۆ خزمەتی کەمئەندامان ، بەتایبەت ئافرەتان و کۆمەڵەی (التحدی) بۆ دروستکردن لە ساڵی ١٩٨٨ داو پانزە ساڵ بەرێوەبەری بوو ، کەوتە راهێنان و مەشق پێکردن و توانی خزمەت بە ٢٠٠٠ کەم ئەندامی ئافرەت بکات و هانیان بدات لەسەر خوێندن و ئەوپەڕی هاوکاری ماددیو مەعنەویان بکات .

ئەم ئافرەتە رازی نەبوو نەشتەرگەریەکی بۆ بکرێت کەبە ریژەی لەسەدا نەوەد ئیحتیمالی چاکبوونەوەی هەبوو ، بۆ ئەوەی بە کەمئەندامی بمێنێتەوەو ئەو هەژارو داماوانە لەیاد نەکات ، کەئەمەش لوتکەی میسالیەتە.

## عمر عبدالعزیز لە لیبیا

نموونەیەکی بالآی ترە کە لەگەڵ ئەوەدا کە نابینا بوو خۆی فێری نووسینی برێل کردو کۆمپانیایەکی دامەزراند بۆ نابیناکان تا فێری کۆمپیوتەریان بکەن .

ژیان هەوڵ و کۆششی دەوێت و من پێشبڕکێم دەکرد لەگەڵ (٢٠٠٠) یاریزانی تێنس داو بە مەشقی زۆر و خۆئامادەکردن و بە فەزڵی خوا پێشیان کەوتم .

من لەئەسکەندەریە گەیشتمە پلەی سێیەم لە کاری ئوتێلداو بوومە بەڕێوەبەری بەش لە ئوتێلی فەلەستین لە ئەسکەندەریە.

لە کەنەداش لە صفرەوە و لە قاپ شتنەوە پشت بەخوا دەستم پێکردەوە ،دیارە هەرچی پشت بەخوا ببەستێ بەسیەتی( وَمَنْ يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ إِنَّ اللَّهَ بَالِغُ أَمْرِهِ قَدْ جَعَلَ اللَّهُ لِكُلِّ شَيْءٍ قَدْرًا (٣)الطلاق).

# گەشتی ژیان

**دوا هەمین رۆژی ژیانی دکتۆر:**

دکتۆر بەڕاستی چاونەترس بوو،داوەتنامەی زۆری لە عێراق و غەززەوە بۆ دەهات وئەمیش نیازی هەبوو بچێت وهەندێ کەس دەیانوویست ساردی بکەنەوە ئەویش دەیووت (من بۆ گەیاندنی زانست دەچم ، ئەگەر مردم شەهید دەبم و ئەچمە بەهەشتەوە ).

هەشت کاژێر پێش مردنی لە کۆتایی ئەو وتارەی کە ئەیدا وتی:من هەموو ولاتە عەرەبیەکان چووم و وتارم تیاداون و ئەمەوێ بشچم بۆ غەززە تالەرێی ئەو زانستەی کەدەیزانم خەڵکی بگەیەنم بەخوا .هەموو چرکەیەکی ژیانتان بەسەربەرن بەخۆشەویستی خواو خۆ جوان کردن بەرەوشتەکانی پێغەمبەر (د.خ).

بەزانستەوە بژین .

بەکردەوەو ئارامگرتن و ئینسانیەتەوە بژین .

بە خۆشەویستیەوە بژین و قەدری ژیان بزانن.

هەموو سائێك وابژی کە وابزانیت دوا سائی ژیانتە.

بۆ خوا بژین..

## گەشتی ژیان

لەساڵی ۲۰۱۲دا پاش بەڕێکردنی ٦۲ ساڵ تەمەن بە دوکەڵی شوققەکەی ژێرخۆیان خنکا ، هەروەها خوشکە گەورەکەی و پیرێژنێکی خزمیشیان کە تەمەنیان ۷۲ ساڵ بوون بەهەمان کارەسات مردن .

ئامالی خێزانی دەڵێت : دکتۆر زۆر دوعای دەکرد شەهید ببێت ، لەوە دەچێت خوا ئەم جۆرە شەهیدیەی بۆ هەڵبژاردبێت .

(سەرچاوە :د. ابراهيم الفقي / قصه كفاح ).د.محمد أبو فرحه .



# گەشتی ژیان

**دکتۆر تاریق رەمەزان:**

تاریق کوڕی سەعید رەمەزانەو ساڵی ١٩٦٢ لە سویسرا لەدایك بوو ، باوکی پێی دەوترا بەننای بچووك کە لە تەمەنی شانزە ساڵیەوە بەننا لەجیاتی خۆی دەینارد بۆ راپەڕاندنی کارەکان لە سەرتاسەری میسرداو دواتریش کچی گەورەی بەننای هێنا .

لەساڵی ١٩٥٤دا کە عەبدول ناسر کەوتە رەشبگیری برایان ، سەعید رەمەزان بە ئەمینداری گشتی موئتەمەری ئیسلامی لەبارەی قودسەوە هەڵبژێردرا، بۆیە میسری بەجێهێشت و لە سویسرا گیرسایەوە لەساڵی ١٩٥٨ داو پاشان لەساڵی ١٩٦١ دا بنکەی ئیسلامی لە جنێف دامەزراند .

پاشان سەعید رەمەزان هەڵبژێردرا بە بەرپرسی برایانی مەنفا .

تاریق هەمیشە وێنەی باپیری شەهیدی لەبەرچاوی بوو ، وەهەرچی سەردانی دەکردن بەرێزەوە باسیان دەکرد.

تاریق لێکۆڵینەوەی چڕوپڕی فیکری حەسەن بەننای باپیری کردو زۆر کاری تێکرد و وای لێکرد کە بۆ خوا بژی و بۆ خوا بمرێت .

# گەشتی ژیان

لە جنێف تاریق چووە قوتابخانەی فەڕەنسیەکان و توانی ماستەرو دکتۆرا بهێنێت لە فەلسەفەو ئەدەبی فەڕەنسیداو بۆ چەند ساڵێکیش مامۆستای ئەدەبی فەڕەنسی بوو .ساڵی ١٩٩٢ هاتەوە میسرو بۆ ساڵێك دیراسەی ئیسلامی خوێند .

تاریق بۆ ماوەی دەساڵ لەکاری خێرخوازیدا لەگەڵ کەسانی خێرخوازی مەسیحی و مرۆڤ دۆست و ڕێکخراوی پزیشکانی بێ سنوورو ڕێکخراوی‌بزەوی مرۆڤدا کاری کردو ئەزموونی باشی لێوە فێربوو.

ناوبراو چەند پەڕاوێکی هەیە وەك :

١-أن تكون مسلما أوروبيا

٢-مسلمو الغرب ومستقبل الاسلام

٣-الاسلام والغرب وتحدى الحداثة

٤-المسلمون فى فرنسا ..الطريق الى التعايش

پێگەی گۆڤاری تایم تارق ڕەمەزانی دانا بە یەکێك لەو سەد کەسەی کە لەسەدەی بیست و یەکدا کاریگەری زۆریان هەبووە .

هەروەها ناوزەدی دەکەن بە (مارتن لوثر)ی ئیسلام ، هەروەها ساڵی ١٩٩٠ رۆژنامە سویسریەکان دایان نا بەیەکێك لەو دەکەسەی کە کاریگەری زۆریان هەبووە لەشاری جنێف دا .

شایانی باسە ساڵی ٢٠٠٤ تا ٢٠١٠ ئەمەریکا رەزامەند نەبوو کە تاریق رەمەزان پێ بنێتە خاکیەوە .لە کاتێکدا کەزانکۆی نۆتردام گرێبەستی لەگەڵ کردبوو کە لەو زانکۆیە وانە بلێتەوە ، ئەوەی سەیرە کە قوتابیە جوولەکەکانی ئەو زانکۆیە زۆر دژی بڕیارەکەی حکومەتی ئەمەریکی بوون لە رێگری کردن لە تاریق رەمەزان .

ناوبراو مامۆستای دیراساتی ئیسلامی سەردەمە لەزانکۆی ئۆکسفۆردی بەریتانی و تۆنی بلێر داوای لێکرد وەك راوێژکارێك کاری لەگەڵ بکات .

ئەمە بێجگە لەوەی لە زانکۆکانی ئەڵمانیاشدا وانەی وتۆتەوە .

تاریق رەمەزانیش وەك باوکی و باپیری دروشمی ئیسلام چارەسەرەی بەرزکردۆتەوەو خوێندنەوەی خۆی هەیە بۆ تەتبیق کردنی ئیسلام لەمك سەردەمەداو تەنانەت لە ساڵی ٢٠٠٥دا بەیاننامەیەکی ئاراستەی زانایانی ئیسلامی کردو داوای کرد کە کە (حەد) و سزا ئیسلامیەکان رابگیرێن چونکە لە زۆربەی زۆری وڵاتە ئیسلامیەکاندا

# گەشتی ژیان

باری ئابووری خراپەو هاوولاتی لانی کەمی بژێوی بۆ دابین ناکرێت و دادگار دادپەروەر نیە .

بۆ چوونەکانی دکتۆر تاریق لایەنگری زۆریان هەیەو لەهەمان کاتیشدا لەلایەن هەندێکەوە دژایەتی دەکرێن .



**دکتۆر مستەفا مەحمود :**

ساڵی ١٩٢١ لەدایك بووەو ٨٨ ساڵ ژیاو لە ٢٠٠٩ دا کۆچی دوایی کرد .ساڵی ١٩٥٣ کۆلیژی پزیشکی تەواوکردو ساڵی ١٩٦٠ وازی لێهێناو خۆی دەستبەتاڵکرد بۆ نووسین .

دووجار ژنی هێناوەو لەیەکەمیان کوڕوکچێکی هەیەو ، لەدووەمیشیان منالّی نیەو لەهەردوکیشیان جیابۆتەوە .

سی سالّ بەدوای هەق و راستیدا گەڕاو سەرەنجام هیدایەتی لە قورئاندا دۆزیەوە و لەدوو پەڕاودا باسی گەڕانەوەی دەکات بەناوی (حوار مع صديقي الملحد ، رحلتي من الشك الى الايمان )، دکتۆر ۸۹ پەڕاوی هەیەو هەندێکیان قسەیان لەسەرە، وەك کتێبی (الله والانسان) کە دادگایی کرا لەسەری و سەرۆکی ئەوسەردەمە سادات دیفاعی لێکردو فەرمانیشی دا چاپ بکرێتەوە ، سادات داوای لێکرد ببێتە وەزیر ، ئەمیش قایل نەبورو وە وتی : من کەنەمتوانیبێت دەزگایەکی بچوکی وەك خێزانەکەم بەرێوە بەرم و سەرکەوتوونەبووم ئێستا چۆن ئەتوانم لە بەرێوەبردنی وەزارەتێکدا سەرکەوتووبم .

ویستی بەرنامەی (العلم والایمان) بەرهەم بهێنێ تەلەفیزیۆنی میسری تەنها سی جونەیهی ئەدایە بۆهەر ئەلّقەیەك کەبەشی هیچی نەدەکرد ، دەولّەمەندێکی بۆ خوا سولّحاو چەکی بەتالّی دایە کەچەندی دەوێت ئەیداتێ بەمەرجێك ئەو کارە مەزنە بکات ، ئەوەبوو ٤٠٠ ئەلّقەی بەرهەم هێناو بەداخەوە بەفەرمانی سەرۆکایەتی میسر راگیرا .

**هۆکاری ئیمان هێنانی :**

دکتۆر دەڵێت : شەو درەنگ دەنووستم و بەیانیان درەنگ هەڵدەستام لەخەو ، بەیانیەکیان بۆمن زوو بوو تەلەفونێکم بۆکرا لەلایەن برادەرێکم بەناوی جەلال عیشری ، کەزانی خواڵووم داوای لێبوردنی کردو منیش خەوتمەوە ، لەخەوما جەلالم بینی لەگەڵ شەوقی عەبدول حەکیمی برادەرم کە لە گڤاری (صباح الخیر) وتاری دەنووسی ، هەردوکیان باسی رەخنەو کۆمەڵێ بابەتی ئەدەبیان دەکرد لە شەقامی سلێمان پاشا ، کەخەبەرم بۆوە تەلەفونم بۆ جەلال کردو وتم : خەوێکی وام دیوە زۆر سەرسام بوو وتی : هەردەڵێی لەگەڵمانا بوویت . منیش زۆر سەرسام بووم لەو خەوە و گەڕام بەدوای هۆکاری ئەو خەوەدا تەنانەت چووم بۆ لای باڵوێزی هیندی و ئەویش ناوی کۆمەڵە کتێبێکی بۆ هەڵدام لەبارەی تەرکیزکردن و شتی ترەوە کە لە کتێبخانەیەکی بەریتانیا گوایە دەست دەکەون ، چووم لەبەریتانیا لەو مەکتەبەیە کتێبەکانم پەیدا کرد کەتۆزیان لێنیشتبوو ، بە خاوەن کتێبخانەکەم وت: ئەم کتێبانە چۆنن ؟؟ وتی: پولێك ناهێنن و لام سەیرە خەڵك پارەیان پێدەدەن .

گەڕامەوە راستی کرد هیچ سوودێکم لێنەبینی تێگەیشتم ئەو جۆرە خەوو ئیلهامە رزقی خوایەو بەشێکە لە ٤٦ بەشی پێغەمبەرایەتی ،وەکو ئیقامەی حوججە پیشانی کافروموسڵمانیشی ئەدات تا بەخۆیانا بچنەوەو لەمەسەلەی غەیب و وەحی تێبگەن .



برادەرێکی کۆمۆنیستیشم خەوی دیبوو کە پاش سێ ڕۆژی تر عبدالناصر دەمرێت ، منیش پێمووت : جا ئەگەر خەوەکەت هاتەدی هەقە واز لە کۆمۆنیستی بهێنیت و ئیمان بهێنی بەخوا چونکە خوا نەبێت کێ دەزانێت سێ ڕۆژی تر ئەوە روودەدات ، ئەوەی سەیرە دوای سێ ڕۆژ عبدالناصر مردوکەچی بەداخەوە ئەو برادەرەم بڕوای نەهێنا.

**گەوهەری بەنرخی ئیسلام**

دکتۆر مستەفا مەحمود دەڵێ: ساڵی ١٩٦٨ لە شاری ریباتی مەغریب ئافرەتێکی فەڕەنسیم بینی تەمەنی شەست ساڵێك دەبوو ، باسی خۆی بۆ کردم و وتی: سی ساڵێك لەمەوبەر لەگەڵ کۆمەڵێك هاوەڵمدا هاتین بۆ مەغریب بۆ گەشتیاری ، شەوێك لە ئوتێل لەخەوما پیاوێکی نورانی جل سپیم بینی هەستم کرد کە پێغەمبەری خوایەو قورئانێکی

دامیّ ، کەخەبەرم بۆوە زۆر سەرسام بووم و بۆ هاوەڵەکانم گێڕایەوە ، کردیانم بەکێوا ، وتیان :ئەوە خەیاڵاتەو لەبیرخۆتی بەرەوە ، سەردانی چەند رۆژهەلاّتناسێکی بیانیم کردو گەیشتمە ئەو قەناعەتەی کەئەو خەوە ئاماژەیە بۆ ئەوەی دیراسەی ئیسلام بکەم .هاوەڵەکانم ویستیان بگەڕێمەوە لەگەڵیان نەگەڕامەوەو دیراسەی ئیسلامم کردو موسڵمانبووم وبڕیارمدا لەمەغریب بژیم ، پاش پانزە ساڵێك لە حەمام خۆم دەشت هەستم بەشتیّ کرد لەسنگمدا چوومە لای پزیشك وتی: بەداخەوە شێرپەنجەیە لەمەمکتداو بلاّویش بۆتەوە بۆسنگت و ماسولکەکانت و لە قۆناغەکانی دوایدایەو ناتوانین هیچت بۆ بکەین .

هاتمەوە نەخۆش و ناساغ لەشوققەکەمدا دەژیام ،پاش ماوەیەك هەندیّ لەهاوەڵە دێرینەکانم هاتنەوە مەغریب و سەردانیان کردم ، کەمنیان بەو حاڵەوە بینی وتیان : وەرەوە لەگەڵمان لای ئێمە پزیشکی باشتر هەیەو چارەسەرت دەکەن .چی هەوڵیان لەگەڵدام نەچوومەوە . شەویّ بەرماڵم داخست وکەوتمە نوێژکردن بەجۆرێك کە هەمووخانەکانی جەستەم لەنوێژدابوون ، زۆرگریام وزۆر پاڕامەوە و وتم : خواتیە تەنها تۆ شك دەبەم وەرە بەهانامەوە ، ئەوەتا هاوەڵەکانم گاڵتەم پیێدەکەن و بەدەروێشێکی سەرگەردان و نەفامم دەزانن . هەرلەسەر بەرماڵەکە خەوم لێکەوت کە بۆ نوێژی بەیانی خەبەرم بۆوە ، هەستم بەچاکی کردو دەستم دا لە سنگم هیچی تیانەمابوو ، بەیانی چوومەوە لای

پزیشکەکەم فەحسی کردم وسەری سوڕما کەچۆن ئەو نەخۆشیە لەجەستەمدا نەماوە.
دکتۆر مستەفا دەڵێت : خۆم نەمبینیایە رەنگ بوو بڕوام نەکردایە ، سبحان الله بەڕاستی خوا هادی یە و خوا کافیەو خوا شافی یە ..ئافرەتەکە پێی وتم : خوای گەورە گەوهەرێکی بەنرخی داونەتێ کەئیسلامەو ئێوە قەدری نازانن .

**مستەفا عەقاد :**

ساڵی ۱۹۳۰ لە شاری حەڵەبی سوریا لەدایك بووە ،بەهۆی دراوسێیەکیانەوە کەخەریکی عەرزکردنی فلیم بوو، حەزی لە کاری هونەری و دەرهێنان کرد ، بۆیە لە تەمەنی ۱۸ساڵیدا بۆ ماوەی ساڵێك ئیشی کرد تابڕێك پارەی کۆکردەوەو باوکیشی دووسەد دۆلارو قورئانێکی دایەولەساڵی ۱۹٥٤ دا چوو بۆ ئەمەریکاوتاساڵی ۱۹٥۸ زانکۆی کالیفۆرنیای تەواوکردولەگەڵ دەرهێنەری بەناوبانگی جیهانی ئەلفەرد هیتشکۆك کاری کردو تەواو شارەزایی پەیداکرد.
وتیان ناوی خۆت بگۆڕە ، قایل نەبوو وتی: ئەوە لەباوکمەوە بۆم ماوەتەوەونایگۆڕم.

**فلیمی ریساله**

دوای هەژدە ساڵ خوێندن و کارکردن لەساڵی ١٩٧٦ فلیمی (الرسالە) ی بەرهەمهێنا . پێنج ساڵ ولاٌتانی عەرەبی گەڕا تا پارەی بۆ پەیدا بکات ، تا کوەیت و مەغریب و لیبیا دەملیۆن دۆلاریان بۆ دابین کرد.

بۆ سیناریۆکەشی چەندنووسەری گەورە وەك (عبدالحمید جودە السحار) دەیاننوسی و دەکرا بە ئینگلیزی تا سیناریستە ئەمەریکیەکە دایرێژێتەوە .

رەزامەندی ئەزهەرو مەرجەعیەتی باڵای شیعەی لوبنان ی وەرگرت .

بۆ وەرگرتنی رەزامەندی رابیتەی جیهانی ئیسلامی سەردانی مەککەی کرد ، ئەوەی سەیربوو زاناکان فلیمەکەیان رەفز کردو وتیان : وێنە حەرامە !! ئەویش وتی: باشە چۆن حەرامە ئەوە وێنەی شا فەیسەڵ نیە لەو رۆژنامەیەدا ، وتیان : ئەوە جیایە ، ئەوەی تۆ وێنەیەو گیانی تیایە !!

وتی: باشە من لەزانکۆ لە ئەمەریکا خوێندومە کە حەسەنی کوڕی هەیسەم لە ئەندەلوس کامێرای دۆزیوەتەوە ، هەرچی کرد لەگەڵیاندا سوودی نەبوو.

فلیمەکەی بەهەردوو زمانی عەرەبی و ئینگلیزی دەرکرد ، بۆ عەرەبیەکە (عەبدولا غیپ) و بۆ ئینگلیزیەکەش (ئەنتۆنی کوێن) رۆڵی حەمزەیان بینی وپاڵەوانی فلیمەکە بوون.









ديكۆرو کەرەسەو ئامێری پێویستی لەمەغریب داناو کەوتە وێنەگرتن ، شای مەغریب دەنێرێت بەدوایداو داوای لێدەکات فلیمەکە رابگرن ، چونکە شافەیسەڵ هەڕەشەی بڕینی پەیوەندی کردبوو لەگەڵ مەغریبداو وتبووی: ئامادەی کۆنگرەی لوتکەی ئیسلامی نابێت ئەگەر ئەو فلیمە

لەمەغریب دەربکرێت .ئەمەش لەبەرئەوەی شا فەیسەڵیان واتێگەیاندبووکە پێغەمبەر لە فلیمەکەدا دەردەکەوێت .

لەکاتێکدا نە خۆشەویست و نە دەمژدە پێدراوەکە دەرنەئەکەوتن.

ناچار هەموو شتەکانی پێچایەوەو بەکەشتی هاتنە تەڕابلوس و چاویان بە قەزافی و مەجلیسی قیادەی پورە کەوت و چەند دیمەنێکی فلیمەکەیان پیشان دان و قەزافی پشتگیری خۆی بۆ دەربڕین و رێی دا لە لیبیا تەواوبکرێت .

فلیمەکە تەواوبوو ، سەیرکردنی فلیمەکە فەتوای بۆ دەرچوو کەحەرامە، کاتێك ویستی لە ١٦٠٠ هۆڵی ئەمەریکا پیشان بدرێت ، ئێف بی ئای پەیوەندی پێوەکرد کە کۆمەڵێك موسڵمانی رەش پێستی حەنەفی ئەمەریکی داویانە بەسەر شوێنێکداو ٢١ کەسیان کردۆتە بارمتە تا فلیمەکە لێنەدرێت ناچار رامانگرت.

وردە وردە وڵاتە ئیسلامیەکان قەناعەتیان بۆ دروست بووکە سەیربکرێت ، کەسێکیش بە ملیۆنێك دۆلار زەمانی شا کڕی و ویستی لەئێران عەرزی بکات نەیانهێشت ، زەمانی خومەینیش شیعە قایل نەبوون بەبیانووی ئەوەی بۆچی بانگەکەی بیلال بەشێوەی بانگی سونەیەو (باسی عەلی و حی علی خیر العمل) ی تیانیە ، تا باسەکە چووە بەردەستی خومەینی ئەو وتی: بالێبدرێت چونکە ئەوسا سونەو شیعە نەبوون.

## گەشتی ژیان

مستەفا عەقائد خاتوو باتریسیای ئەمەریکی هێنا کە ماستەری هەبوو لە ئاداب و هونەردا و چەند زمانێکی دەزانی و هاوەڵی بوو لەزانکۆ ، کچێکی لێی بوو بەناوی ریما.

دواتر ژنێکی سوری هێنا بەناوی (سهی زەید) کەدووکوڕی لێی بوو(تاری و مالیك) .

عەقاد بیری دەکردەوە کە فلیمێك بەرهەم بهێنرێت تا ئیسلام بە ژنەکەی و ئەمەریکیەکان بناسێنرێت ، دیارە بیانیەکان عەرەبی نازانن و رەنگە نەخوێننەوە ، بەڵام فلیمێك دەتوانێت بەچاکی ببێتە پردێك لەنێوان ئیسلام و ئەواندا.

دوایی گەیشتە ئەو قەناعەتەی کە ئەو کارە بەخۆی دەکرێت بۆ نەیکات.بۆ ئەم کارەش ئەکتەری جیهانی بەکارهێنا چونکە ئەوانەلای جیهان ناسراون و کاریگەریان زیاتر دەبێت .بەتایبەت بۆ فلیمی عومەرموختار کە ئەنتۆنی کوین و ئۆلیڤەر رید دەوریان تیا بینی .کەساڵی ١٩٨١ بەرهەمی هێنا.

عەقاد چەند فلیمێکی ترسیشی دەرکردەوە لەبەرئەوەی ئەمەریکیەکان حەزیان پێی بوو تا لەو رێیەوە پارەیەکی دەست بکەوێت و کارەکانی پێبکات.

**کاریگەری فلیمەکە :**

لە ئوتێل لە لیبیا کارەباچیەکی رەشپێستی بینی دەورە وەحشی دایە ، لەکاتی وێنەگرتندا ئەوەندە ئەکتەرەکان چووبوونە دەورەکەیانەوە

لائیرادی لە نص ەکە دەردەچوون و ڕێیان بۆ وەحشی نەدەکردەوە حەمزە بکوژێت .

هەروەها ئەکتەرەکان کەسیان حەزیان نەدەکرد دەوری بێباوەڕەکان ببینن .پاش چەند ساڵێك لەفلیمەکە ئەو ئەکتەرە دەبینێتەوە کە رۆڵی وەحشی بینی ، وتی: تۆ ماڵی منت کاول کرد کەس ئیشم ناداتیّ وەزانن من حەمزەم کوشتووە، بۆیە ناچار هەوڵی بۆ ئەدات ککە وەزارەتی رۆشنبیری موچەیەکی بۆ ببڕێتەوە.

ژنی ئەنتۆنی کوین دەڵێت : تا ساڵێکیش دوای فلیمی عومەر موختار ناوبراو لەژێر کاریگەری فلیمەکەدا بوو، وەك عومەر موختار هەڵس و کەوتی دەکرد.



شایانی باسە کە نزیکەی سی هەزارکەس بەهۆی ریسالـەوە لە ئەمەریکا موسڵمان بوون.

عەقاد بەتەمابوو لەسەر سەماحەتی ئیسلام فلیمێك لەبارەی سەلاحەدینەوە دەربکات ، بەڵام چونکە کەسێکی تر فلیمێکی دەرکرد لەسەری وازی لەوە هێناو بەتەمابوو لەسەر ئەندەلوس و ئوسامە بن لادن فلیم دەربکات .

**کۆچی دوایی:**

ساڵی ٢٠٠٥ ئەچێ بۆ ئەردەن بۆ ئوتێلی گراند حەیات بۆ ئاهەنگی هاوسەرگیری هاوەڵێکی و چاوەڕێی کچەکەی دەکات ،کە کچەکەی دەگات قاعیدە تەقینەوەیەکەی خۆکوژی دەکات و خۆی کچەکەی و چەند بەرپرسێکی فەلەستینیش کەئامادەبوون دەکوژرێن.

کچەکەی دووکوڕی لەپاش بەجێماو یەکەم خۆشەویستی باوکی بوو ، بەقەدەری خوا مێردەکەی پێش دووخولەك رای خۆی دەگۆڕێت لەوەی کەئەویش لەلوبنانەوە لەگەڵیا بچێت بۆ ئەردەن وبڕیارئەدات کەچوونەکەی بخاتە رۆژی دواتر ، بەڵام بەداخەوە ئەو کارەساتە دەقەومێت.

**گرنگی سینەما لەناساندنی ئیسلامدا :**

موسڵمانان دەرهێنەرێکی مەزنی جیهانیان دەستکەوت کەوتی: پارەی فرۆکەیەکی جەنگیم بدەنێ رای جیهانتان بۆ دەگۆڕم بەرامبەر ئیسلام ، بەلاَم بەداخەوە قەدریان نەزانی وهاوکاریان نەکرد تا وەك خۆر ئاوابوو.

سەرۆکی ئەمەریکی رۆزفلت کە هۆلیوودی کردەوە وتی: لێرەوە گەورەیی و مەزنی ئەمەریکا دروست دەکەین .

بۆشی باوك کەسەرپەرشتی قۆناغەکانی کۆتایی رووخانی رووسیای دەکردبەرێوەبەری کۆمپانیای (مترۆ گۆڵدن مایر) پێی وت:هەمبەرگرو جێنزو هۆلیودو کۆمپانیاکانی جگەرە رۆڵی گەورەیان بینی لە گەورە پیشاندانی ئەمەریکاداو وایان کرد لەجەنگی ساردا سەربکەوێت .

روسیاش لەمەترسی هۆلیود تێگەیشتبوو بۆیە خرۆشۆف وتی: ئەوەندەی لەهۆلیود ئەترسم ئەوەندە لە صاروخەکانی ئەمەریکا ناترسم.

دەرهێنەرێکەی گەورەی فەڕەنسیش بە گەلەکەی دەڵێت :پێش سی ساڵ پێم نەوتن ئەمەریکا بەفلیمەکانی غەزومان دەکات.

یوسف شاهێن دەڵێت : عەقاد لەباشترین دەرهێنەرەکانی جیهان بور.

**ئاواتی عەقاد :**

رەحمەتی ئاواتی بووشارێکی سینەمایی دروست بکرێت کە ١٥٠ ملیۆن دیناری تێدەچوو، ئاواتی بوو لەسەر ئەندەلوس و پرۆژەی تر کاربکات وئەجەل بواری نەدا .

کوڕەکەی بەبێ ئاگاداری ئەم بواری سینەمای خوێند و بانگی کرد بۆ پیشاندانی فلیمی تەخەروجەکەی کەباشترین فلیمی تەخەروج دەرچوو لەسەر ئاستی ئەمەریکا.

پێی وت : بۆ ئاگادارت نەکردم ؟وتی: حەزم کرد لەسەر پێی خۆم بوەستم و خۆم خۆم دروست بکەم وەك تۆ .جا هیوا وایە کە کوڕەکەی جێی باوکی بگرێتەوە.

دوای سەرکەوتنی هەردوو فلیمی ریسالە و عومەر موختار و وەرگرتنی چەند خەلاتێکی هونەری ،دەسەلاتداران داوایان لێکرد کاری هونەری تایبەت بەخۆیان بۆ بکات ، ئەمیش نەیویست بچێتە ئەو گەمەی سیاسیەوەو وتی:کەسەکان دەڕۆن و منیش خاوەنی پەیامێکی گەورەترم وئەمەوێت کار بۆ ئومەتەکەم بکەم.

### ئیشەکانی خوا سەیرن!

عەلی طنطاوی ساڵی ١٩٠٩ لە سوریا لەدایك بووە.

ساڵی ١٩٣١ بووە بەمامۆستا .ساڵی ١٩٣٣ لیسانسی لە حقوقدا وەرگرت .ساڵی ١٩٣٦ هاتە عێراق و بووە مودەڕیس لەسانەوی مەرکەزی بەغدا.

لەساڵی ١٩٤٠ کە لەشام مامۆستا بوو، لەوتارێکدا هێرشی کردە سەر فەڕەنسیەکان و وتی: لەفەڕەنسیەکان مەترسن ، هیچیان لەبارانیەو

# گەشتی ژیان

ئاگریان هیچ ناسوتێنێ و فیشەکیان کەس ناکوژێت ، ئەگەر خێریان تیابو ایە ئەڵمانیا پێی نەئەنایە خاکیانەوە .



بەهۆی ئەم وتارەوە نەیانهێشت مامۆستایەتی بکا بۆیە بووە قازی بۆماوەی بیست و پێنج ساڵێك ، ساڵی ۱۹٦۳ چووە شاری( ریاض ) و بووە مامۆستا لەزانکۆ .

۳۵ ساڵ لەمەککە بوو ، لەساڵی ۱۹۳۰ یەوە یەکەم بێژەری عەرەبە کە لە رادیۆوە قسەی کردووەو تاساڵی ۱۹۸۰ وتاری پێشکەش کردووە لەرادیۆو تەلەفیزیۆندا .

پێنج کچی هەبوو بەنانیان شووی کرد بە عصام العطار بانگخوازی سوری کە چووە ئەڵمانیا موخابەراتی سوری لەوێ شەهیدیان کرد.

شێخ عەلی نووسەرو ئەدیبێکی گەورەیەو ژمارەیەکی زۆر پەڕاوی هەیە کە سوودێکی زۆری گەیاندووە بەموسڵمانان.

شێخ عەلی دەڵێت : کە قازی بووم شەوێکیان لەگەڵ برادەرانمدا لەجێیەك دانیشتبوین ، زۆر هەستم بەدڵتەنگی دەکرد ، خەریك بوو بخنکێم ، بۆیە بەجێم هێشتن و لەرێگا کەتاریك بوو گوێم لە گریانی ژنێك بوو، چوومەلای و لێم پرسی بۆ دەگریت ؟ وتی: مێردەکەم تەلاقی داوم و نایەڵێ منالەکانم ببینم و کەسیشم نیە .

منیش پێم وت: بچۆ بۆلای قازی شکاتی لێبکە. ئەویش وتی: منی داماو بەچی دەگەمە لای قازی ..

جا شێخ عەلی دەگریاو وتی: نەیزانی کەئەو بێدەسەڵاتەو داماوەو ناگاتە لای قازی خوا قازی ئەهێنێ بۆ لای ئەو. ساڵی ١٩٩٩ لەمەککە گیانی سپاردو هەر لەوێش بەخاکیان سپارد.

## کاروانی ژیانم

ئەمە ناونیشانی ژیاننامەی پرۆفیسۆر مستەفا زەلمیە ، سەرگوزەشتەی ٧٧ ساڵی تەمەنیەتی لەپێشەکیەکەیدا دەڵێت :



لە بەهاری ساڵی ١٩٢٤ز لە دێی زێدم هاتومەتە ئەم دونیایەوە، تا ئێستا کە یاداشتەکانم دەنووسمەوە، نە لەم دونیایە گەیشتم و نە لەو کەسانەی لە گەڵیاندا ژیام، بیروباوەڕم بەخوای گەورە و پێغەمبەر (ﷺ) و ئاینی ئیسلام زۆر پتەو و بەهێزە، چونکە ئەم بیروباوەڕەم لە ڕێگەی دواکەوتنی دایک و باوکەوە نەبوو - ئیمانی تەقلیدی- بەڵکو لەماوەی ژیانمدا لە نێوان بەراوردکردنی ئاینی ئیسلام و هەموو یاسای دەوڵەتان و بیروباوەڕی جیاوازو ئاینەکانی تر زیاتر لە چل ساڵ و، تێکەڵاویم لەگەڵ خەڵکی جیاوازی جۆر بەجۆر ئەم بیروباوەڕەم بۆ دروست بوو، شتێکم نەدی ئیسلام بڵێت مەیکە ژیری بڵێت بیکە، هەروەها بە پێچەوانەی ئەوەوە شتێکم نەدی ئیسلام بڵێت بیکە ژیری بڵێت مەیکە، گەورەترین شت بۆ ژیانی ئادەمیزاد لە ئیسلامدا ئەوەیە پەیوەندیت دەبەستێت بەهێزێکی نادیارەوە کە پێی دەوترێت - خوا- تەنها ئەو نادیارە دەتوانێت ڕۆحی نادیارمان خۆشحاڵ بکات و، هەر تەنها ئەوە دەتوانێت ڕۆحی نادیارمان لە ژەنگ و پیسی جیهانی ماددە ڕزگار بکات تەنها تەشقی خوای نادیارە خۆشییەکانی بێ سنوورە وەکو دەریاکان

# گەشتی ژیان

لەکاروانی ژیانی مامۆستازەڵمیەوە :

١-خوێندنی حوجرەو کەم و کورتیەکانی کە مامۆستا دەڵێت : مەلایەك پاش ١٢ ساڵ ڕەنج وماندووبوون بەحساب کلیلیان داوەتێ بۆ کردنەوەو تێگەیشتنی قورئان و سوننە بەلاّم بەوکلیلە هیچی نەدەکردەوە و ئەڵێ من مەلای دوانزە عیلم بووم زۆر شتم نەدەزانی ونەدەچوینەوەسەر سەرچاوەسەرەکیەکان تا ئێمەش وەك شافیعی وئیمامەکان قسەمان هەبێت .

٢-بەداخەوە حەسادەت ودژایەتی کردنی یەکتری لەناو زانایانیشدا هەیەو زۆر ئازاری مامۆستایان داوە ، بەتایبەت هەندێ کەدەیانویست بەریش و دیمەنی رووکەش خەڵك لەخشتە بەرن ، کەئەمەش وای لێدەکات لەداخیان هەتا ماوە ریش بتاشێت .

٣-شێخایەتی ودینداری بە ویراسەت نیە ، بۆیە باسی هەندێ هەڵویستی دیندارانەی شێخ دەکات و پاشان باسی هەندێ ناهەقی دەکات کەنەدەبوو لەو شێخانە بقەومایە.ئنجا باسی نەفامی هەندێك دەکات کە زیادەڕەوی دەکەن لەو شێخانەدا.

٤-باسی مێژوویەکی ٧٧ ساڵ دەکات کە بەڕاستی بۆ هەموومان زەرووره بیزانین.

٥-کۆمەڵێ ئیجتیهادی نوێی کردووە کە بەڵگەی قوڵبوونەوەیەتی لە شەریعەت و یاسادا کەلەهەردووکیاندا دکتۆرای هەیەو بەدووساڵ هەردوو دکتۆراکەی ئامادەکردووە لەمیسر.

٦-مامۆستا گەیشتە پلەیەك صدام حسێن فەرمانێکی دەرکرد بۆی کەنابێت تامردن خانەنشین بکرێت بۆ ئەوەی سوود بەقوتابیان بگەیەنێت ، کەبڕواناکەم ئەو فەرمانە بۆکەس دەرچووبێت .

٧- بەو هەموو زانستەوە بەناوسەلەفیەك دەڵێت : مامۆستا زەڵمی عیلمی هەیەو دینی نیە ، رەنگە لەبەر نەبوونی ریش بێت !!لاحول ولا قوە الا باللە، (لاتان سەیرنەبێ یەکێکیان لەیەمەن بە دکتۆر عبدالکریم زەیدانی وتبوو پشقلێك ناهێنیێ )ئەوەیە جەرح و تەعدیلی ئاخر زەمان !!

٧-ئنجا بۆ ئەوانەی کە کتێبەکەیان دەستناکەوێت یان بۆیان ناکرێت بیخوێننەوە چەند بابەتێکی زەرووری دەخەمە خزمەتتان چونکە من نامەوێت تەنها بۆخۆم بخوێنمەوەو دەمەوێت ئێوەش سوودمەند بن .

**چەند وێستگەیەك لە ژیانی مامۆستا زەڵمی:**

١- لەچوارساڵیدا رۆژێك جلەکانی تەڕدەبێت و لەبەرئاگرێك خۆی وشك دەکاتەوە دەکەوێتە ناوی و دەسوتێ و هەشت مانگ چارەسەریان کرد تا چاکبووەوە ،ئەمەش یەکەم کۆسپی ژیانی بوو.

بەمناڵی بە ناڕەحەتیەکی زۆر دوو لەسەر سێی قورئان لای میرزا فەتحوڵاَ و مەلا ژن تەواودەکات .

٢-هاوکاری فەقێیان و مەلاکان لەلایەن خەڵکیەوەحاڵەتێکی ناخۆشی بۆیان دروستکردبوو چونکە زۆربەی جار گرانی ونەبوونی یەخەی خەڵکی گرتبوو فریای خۆیان نەدەکەوتن جاوەرە نان بدەن بەفەقێ .

٣- لەحوجرەی فەقێیان کەدووقات بوو شەوێك یاریەکیان کردوەو هاتۆتەدوواوە و لای پەنجەرەوەبووە کەوتۆتە خوارەوە بە پشتا ولەهۆش خۆی چووە خوا بۆخۆی نەیکوشتووە ئەگینا دەبوایە بمردایە.

٤- زوڵم وزۆری ئاغاو بەگەکانی ناوچەکە وای کردبوو خەڵکەکە ئۆخەی بکەن بۆ مردنیان.

لەدێی سەرگەت ئەفراسیاو بەگ دەمرێت ئەوانەی کە دەهاتن بۆ سەرخۆشی عادەت وابوو تۆزێ قورِ بخەنە سەر سەریان یان سەرشانیان ، وە بڵێت ئاغارِۆ ، جا کە ئەمەیان دەوت و بەسووکیش دەیانووت : ئۆخەی!

٥-لەسلیێمانی فەقێ دەبێت تووشی نەخۆشیەك دەبێت و دەیبەنە خەستەخانە پاش یەك هەفتە دێتەوە هۆش خۆی و سەیردەکات تووك بەسەریەوە نەماوەو دکتۆرەکەش پێی دەڵێ:غەم مەخۆ کفنەکەت درِی ، واتە نامری .

٦- جارێك لەگەڵ هاوەڵێکیدا کەدەرِۆن بۆ خوێندن و ئەم دێ و ئەو دێ دەکەن ، پردی وەندەن دێتە رێیان لەسەر ئاوی سیروان کە لە لقەمێوی درێژ دروستکرابوو وەك جۆلانە وابوو ، کە بەگاگۆڵکێ بەسەریا دەپەرِێتەوە لەنیوەی پردەکەدا لەترسا ئایەت الکرسی بیردەچێتەوە ، جارێك لە رِیش سپیەکی ناوچەکە دەپرسن پردی سیرات چۆنە ؟ ئەڵێ :وەك پردی وەندەنە.

٧- کاتێك لەگەڵ فەقێ ئەورەحمانی برادەریدا دەچن بۆ دێی دەگاگا لەدیوی ئێران بەفروسەرمایەکی سەخت دەبێت، وەزانێ کات بەبەریەوە ماوە تومەز سەعاتەکەی نووستووە ، شەوبەسەریاندا دێت و ڕێیان لێتێك دەچێ وبەتەمای ژیان نامێنن و زۆردوعا دەکەن ، کاتێك بەخۆیان دەزانن سەگێك دەوەڕێت وەك ئەوەی بانگیان بکات ، بەرەو دەنگەکە دەچن تا دەگەنە دێیەکەو بەوە خوا لەمردن ڕزگاریان دەکات.

٨- مامۆستا دەڵێت :جارێك کە لە قەڵادزێ وە سواری لۆریەك بووم بۆ سلێمانی لە توورەکەیەکدا سێوی لاسوورەی سەردەشتی تیابوو دانەیەکم دەرهێناو ، لەسلێمانی هەندێ دیاریم بۆ خزمانم کڕی کەدووساڵ بوو لێیان دووربووم و جووتێ پێڵاوی ژنانەی چاکیشم بۆ دایکم کڕی خستمە ناوبوخچەیەکەوە و لەدوکانی خزمێکمان دامنا کەبرادەری باوکم بوو . کەبۆ بەیانی بوخچەکەم وەرگرتەوە مشك چوو بوو بۆ سێوەکەو چەرمی پێڵاوەکەشی دڕیبوو .

لەمەوە تێگەیشتم کە سزای سێوەکە کە دە فلس بوو وەرمگرتەوە بەدەقات و زیانی سەد فلسم لێکەوت.هەروەها بۆم دەرکەوت کە یەکێك چەند بەلایەوە شتێك بچوك بێت ئەوا سزاکەی وەردەگرێت بەچاك یان بەخراپ .( دیارە کەسانێك هەن زۆر تاوانی گەورەتر دەکەن و خوا لغاویان بۆ شل دەکات ، بەڵام دیارە خوا ویستویەتی ئەم زوو بەو تاوانەبچوکەشەوە تەمێ بکات) .

٩-کاتێ لەساڵی ١٩٤٧ لە دێی سەرسیان لە پشدەر مەلا دەبێت، مودیری مەعاریف لەگەڕانەوەیدا لە قەڵادزێ سەری دێیەکەی ئەم ئەدات و میوانی ئاغا دەبیت و زۆر هانی ئەدات کە بێتە سولەیمانی .

بەقەدەری خوا ئێوارەیەك کە مامۆستاو هاوسەرەکەی نان دەخۆن بێ لەدەرگادان دەروێشێك خۆی دەکا بەژووردا کەنایناسن و پاش نان وچا خواردن دەڵێت :مامۆستا دەزانیت مەلاکەی مزگەوتی بن تەبەق لەسلێمانی مرد ، هەندێ مەلا خۆیان ئامادەکردووە بۆ جێگەکەی ، ئەو شەوە لە خۆشیا خەوی لێناکەوێت و بەیانی دێت بۆ سولەیمانی ،چەند مامۆستای زانای وەك مەلا عەبدولاّی چروستانی لەپێش دەرۆژەوە خۆیان بۆ ئامادەکردبوو ، ئەم تەنها یەك رۆژی لەبەردەما دەبێت ،بەوەشەوە لە تاقیکردنەوەکەدا دووەم دەبێت .

کە دەفتەری تاقیکردنەوەکە ئەداتە دەست شێخ محمدی خاڵ و ئەچێتە دەرەوە شێخ سەیرێکی دەفتەرەکە دەکات و پاشان دەڵێت : مەلا مەرۆ میوانی منیت ، نیوەڕۆ لای ئەو نان دەخوات و عەسریش کە بازرگانەکانی شاردێن بۆلای پێیان دەڵێت : ئێوە ئەم مامۆستایە ناناسن ،لیرەیەکی ئاڵتونەو بووە بەژێر تۆزو خۆڵەوەوئەگەر ئەمجارەش لەتاقیکردنەوەکەدا دەرنەچێ ، دەبێ هەربێتە شارەکەوە تا فوتابیان لێی سوودمەند بن .

# گەشتی ژیان

مەلا عەزیزی جوانرۆیی یەکەم بوو خەڵکی گەڕەك رازی نەبوون پێی، دەبوو ئەم دانێن دووەم بووم ، ئەوقاف وتی: ئەگەریەکەم نەبێت بەمەلایان مووچەی نادەینێ و ئەبێ خەڵکەکە بیدات .

بەوجۆرە بووە مەلایان و هاتە سولەیمانی و خەڵکەکە پارەیان بۆ کۆدەکردەوە.

مامۆستا دەڵێت :

لەمزگەوتی بن تەبەق نالەبارێکم لێپەیدابوو دەنگی خۆش بوو شارەزای تەجوید بوو سێ مانگ دوای مردنی مەلا پێشنوێژی بۆ کردبوون ، کەمن چووم نوێژی ئێوارەو خەوتنان یەخەی دەگرتم لەسەر تەجوید و سەری لێشێواندبووم.

فەقێیەکی زیرەکم هەبوو بانگی ئەدا پێیان وت: ئیتر بانگ مەدە چونکە بانگەکەی تۆ لادێیانەیە ئەویش لەداخا مزگەوتەکەی بەجێهێشت. یەکێکیان وتی: مەلا نوێژەکەمان باش بۆبکە پارە لەجگەرەوە دەردێ ، بەمەرجێك مانگی سەد فلسی ئەدا ، یەکێکی تردەیووت: بڕۆ بۆلای مەلا کوێرەکانی مزگەوتی گەورە نوێژەکەت رەوان بکە.

زۆر بێتاقەت بووم و چوومە ژووری وانەوتنەوەو وتم : خوایە خۆمن ئەیوب نیم بەرگەی ئەو هەمووە بگرم . خوا کردی بۆ سبەینێ ئەو نالەبارەی ئیزعاجی کردبووم هات و وتی: هەردووگوێم نابیستێ ، وتم: نەجاتم بوو لەدەستی.

کەچی دوای هەفتەیەك گوێی بەربوو ، وتم : خوایە چ گوناهێکم کردووە ، کەچی دواتر چاوی کوێربوو نەدەهات بۆ مزگەوت من سەرم نەداو رزگارم بوو .

١٠- دوانزە ساڵ بەو هەموو ناڕەحەتیە خوێندم و ئەوە بووە هۆی کرانەوەی مێشکم و لەساڵی ١٩٦٠دا لەکۆلیژی یاسا کەوەرگیرام باشتر لە قوتابیەکانی تر لەوانەکان دەگەیشتم وتوانیم دواتر سێ ماستەرو دوو دکتۆرا بهێنم و زیاتر لە بیست کتێبیش بنووسم .من لەزانکۆ کتێبی کەسم نەوتۆتەوەو هەر بابەتێکیان بۆ دانابم کتێبێکم داناوەو کردوومە بە مەنهەج و ئێستا کتێبەکانیشم لە چەند زانکۆیەك کراونەتە مەنهەج.

١١- زیاتر لەشەست ساڵە لەگەڵ شەریعەتی ئیسلام دەژیم ، زیاتر لە چل ساڵ لەگەڵ یاسای هەموو ولاّتان دەژیم ، زیاتر لە ٢٥ ساڵ بەراوورد دەکەم لەنێوان یاساو شەریعەتی ئیسلامدا ، هیچ بیروباوەڕێکم نەدیوە بەهێندەی ئیسلام جوان بێت .

١٢-مامۆستا دەڵێت : لە یادی هەشتا ساڵەی تەمەنی ئەنیشتایندا لێیان پرسی : لەگەڵ پیریدا چۆنی ؟ وتی: من پیری ناناسم ! هەرکاتێك پیری ویستبێتی بێت بۆلام من سەرقاڵ بووم ، بۆیە بواری ئەوەم نەبوو بیناسم .

١٣- لەبەرهەژاری کەنەیبوو شیر بۆئەحمەدی کوڕی بکڕێت ئەحمەد وشکبووەو مرد ، کەئەمەش زۆر کاری لەمامۆستا کرد کە ئەو ڕێیەی

گرتووەو لەبەر نەبوونی کوڕەکەی مردو حەزی دەکرد ئەمیش بنێژن لەگەڵیدا لەقەبرەکەدا.

١٤-میوانی زۆری ناوچەکەیان وئەوانەی هەناریان دەفرۆشت نەدەچوونە ئوتێل و دەهاتنە ماڵی ئەمان و یەك ژووریان هەبوو میوانەکەی تیادەنوست و ئەم و خێزانیشی ئەچوونە ژووری خەڵوزوو عەباکەی مامۆستایان ئەدا بەخۆیاندا. کەئەمەش مایەی نارەحەتی بوو.

١٥-لەوزەمانەدا مەلاکان کە ئیجازەیان وەردەگرت ئاگایان لەوشتانە نەبوو کەپەیوەندی بەژیانی جیهانەوەیە ومامۆستا نوری فارس لای مامۆستایەك دەیخوێند لەسەرئەوەی رۆژنامەی خوێندبۆوە دەری کردبوو.

١٦- لەسەر ئەوەی کەتەلاق سیێ بەسیێ بەیەکجاردەکەوێت و هەندێ مەلا کارگەی تەلاق چاکردنەوەیان دانابوو ، ساڵی ١٩٧٧ ناسیاوێکی تووشی ئەو حاڵەتە دەبێت و ئەمیش فەتوای بۆدەدات کەئەوە یەك تەلاقی کەوتووەو ژنەکەی مارەبکاتەوەو دووجاری ماوە ، دیارە مەلاکان لێی دەکەنە هەلاّ ، ئەویش نامەیەك دەنووسێ و بابەتەکەروون دەکاتەوە ، ئنجا ناسیاوەکەی نامەکە دەبات بۆلای مامۆستا مەلا محمدی مەلا بەها لە خورماڵ و دەفەرموێ :ئەوەی نووسیویەتی راستە، ئنجا دەیباتە لای مامۆستا مەلا عوسمان ئەویش دەڵێت : من نە لە مەلا مستەفا موسڵمان ترم ، نە لەو زاناترم ، بێنە با ئیمزای بکەم ئەوەی نووسراوە هەمووی راستە.

١٧-ئەم ئایەتە( وَعَسَى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئًا وَهُوَ خَيْرٌ لَكُمْ وَعَسَى أَنْ تُحِبُّوا شَيْئًا وَهُوَ شَرٌّ لَكُمْ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنْتُمْ لَا تَعْلَمُونَ (٢١٦) البقرە ) لەژیانمدا بەچاوی خۆم دیومە ، کە کە لەدێیەکەی خۆم نەمتوانی بمێنمەوەو مەلایەتی بکەم وەمزانی نەگبەتیە کەچی بۆم بور بەخێر ، لەسولەیمانیش کەمەلاکان بووختانیان بۆکردم و چوونە لای موتەصەریف وفەقێیان سارد کردەوە لەلام بخوێنیّ ،سولەیمانیم بەجێهێشت بۆم بوو بەخێرو چوومە سلکی سوپاوەوبووم بەمەلای سوپا بەپلەی ئەفسەرو دواتر خوێندنم تەواوکردو خۆم خانەنشین کردودکتۆراشم خوێند وبوومە مامۆستای زانکۆ.

١٨-چووم بۆ زانکۆی موستەنصریە وەریان نەگرتم وانەبلێمەوە ، قەرزاربووم و زۆر پێویستم بە ئیشێك بوو ، خوا کردی لەوەزارەتی بەرگریەوە بانگیان کردم لەدەورەیەکی پێنج مانگی بۆ ئەفسەرەکانیان کە فارسی بلێمەوە ، رۆژێك زۆر بێتاقەت بووم خوا نەقیبێکی دەورەکەی بۆکردم بەسەبەب کە ئەفسەری کۆشکی کۆماری بوو، هات لەگەڵما و لای راگری کۆلێجەکەوتی: وا بزانە مستەفا منە یان برای منەو دایمەزرێنە. بەمەش خوا دەرگای زانکۆی لێکردمەوە.ئەگەر خوا شتێکی ویست هۆکارەکانی دەڕەخسێنیّ .

# گەشتی ژیان

**ماموستا مەلا محمدی بەرزنجی :**



رۆژی ٢٠١٥/٤/٢ لە یەکەم رۆژی کۆنگرەی زانستی جیهانی رێکخراوی الزاد العراقیە بۆ قیرائات لە ئوتێل تایتانیك کاك دکتۆر صباح بەرزنجیم بینی وتی:

سەرنەوی کەو بەتەنیٚ رێبکە رێبواری عەزیز

نزمە دەرگای عەدەم وتەنگە گوزەر یاری عەزیز

# گەشتی ژیان

دیارە پاش تەمەنێك لەم دونیایەدا كەوەك خەوە ، ئەبێ كۆم بیتەوەوبچەمێیتەوە تا لەدەرگای دونیا دەرچیت بەتەنیا بەرەو قیامەت ،ئەوەندەش دەرگاكە باریكە هەربەتەنیا دەبێت گوزەربكەی پیایدا.

ئنجا باسی جەنابی مامۆستای باوكی كردو وتی:

ساڵی ١٩٣٧شێخ نەجیبی باپیرم وشێخ رەشادی برای و شێخ قادری برای ، (كەخەڵكی سەرگەت بوون )،لەگەڵ سی و حەوت كەسی تر بەند دەكرێن لە سولەیمانی لەسەر ئەوەی كە چەكیان هەڵگرتبوو دژی بەگزادەكان كە ئەو كاتە پیاوی رژێمی پاشایەتی بوون، لەناوبەندكراوەكاندا سەید عەتای چەتەو حەمە رەشید خانی بانەشی تیابووە كەدۆستی شێخ لەتیفی حەفید بووە .

شێخ عەلائەدینی بیارە كە خاڵۆزاو پورزان لەگەڵ باپیرمدا پێی راگەیاندن كەدوعای بۆكردوون و سجنەكە بشكێنن و راكەن . ئەوەبوو شێخ لەتیف دووكیلۆ شیرینیان بۆ دەنێرێ كە دوو دەمانچەی لەژێرا دانابوو.

لە ١٩٣٧/٨/٢٢ سجنەكە دەشكێنن و رادەكەن بەرەو ئێران وئەچنە مەریوان.باپیرم لەودیو كچی حسێن خانی ولەژێر بەگزادەی فەتالی بەگی دێنێ .

# گەشتی ژیان

باوکم ساڵی ١٩٤٥ لەدایك دەبێت وهەرلەمناڵیەوە دەیخەنە حوجرەو کە جزمی عەمە تەواودەکات مامۆستاکەی داوا لەم و هاوەڵەکانی دەکات کە قورئانی سی جزمی ببەن بۆ دەرس خوێندن ، دیارە ئەوزەمانە قورئانی گەورە زۆر کەمبووە بەتایبەت لەلادێ .

ئەوکاتە تەمەنی مامۆستا مەلا محمد شەش حەوت ساڵێك دەبوو شەو خەو بەخۆشەویستەوە دەبینێ (د.خ)، کە قورئانێکی بەدەستەوەیەو مناڵان سەرەیان گرتووە بۆی ، ئەمیش لەدوواوە دەبێت زۆرخەمی دەبێت کە قورئانەکە بدات بەم ، بەهەرحاڵ ئاواتەکەی دێتەدی و کە دەگاتە بەردەم سەروەر قورئانەکەی ئەداتێ و خەبەری دەبێتەوە ، ئەملا دەکاو ئەولا دەکات و بەدایکی دەڵێت : کوا قورئانەکەم ؟؟ئەویش دەڵێت : قورئانی چی کوڕی خۆم دیارە خەوت بینیوە.

کەدەچێت بۆمزگەوت مەلا عارفی ولەژێر دەبینێت کەخەلیفەی شێخی بیارەبوو ، وە زانایەکی خواناسی نەفس موزەکابوو،قورئانێکی بەدەستەوە دەبێت دەیداتێ و دەڵێت : ئەوە قورئانەکەی پێغەمبەر (د.خ) .

باوکم لەکانی میران لای مەریوان مەلا بوو ، ساواك ئەنێرن بیگرن ئەویش دەڵێت ، خۆم دێم ، پێش ئەوەی بچێت سەردانی حەمەخانی کانی سانان دەکات کەتەمەنی شەست ساڵێك دەبوو ، حەمە خان پێی

دەڵێت :بەتەنهامەچۆ نەك تووشی بەڵایەکت بکەن ، من پێش تۆ دەچم و بەرامبەردەرگاکە دائەنیشم تاچاوم لێبێت کە دێت .

حەمەخان دەچێت بۆلای سەرهەنگی ئاسایش و کە دەبینێ ماموستا مەلا محمد دەچێت ، دەچێ بەرەو پیری دەستی ماچ دەکاو دایدەنیشێنێ و بە سەرهەنگەکە دەڵێت : ئەمە باوکی لەساداتەوە دایکیشی بەگزادەیەو ئێمە خاڵوانی ئەوین و پیاوێکی ئاوا باش و خواناسەو کۆمەڵێك مەدحی دەکات .

کابرای سەرهەنگیش (پلەیەکی سەربازیە)سەرسام دەبێ و دەڵێت : وەڵا راپۆرتی لەسەرهاتووە کەبەکوردی نامەی نووسیوە ، نیازمان بووە بیگرین ، بەڵام والەبەر تۆ راپۆرتەکە ئەدرێنم.



## گەشتی ژیان

سەرەتای هەشتاکان کەدەچێتە ئێران و سەرنی شیعە دەبینن چالاکەو کاریگەری هەیەو سوننەیە ، دەیانەوێت بەپیلانێك بیکوژن ، خوا فەرماندەیەکی سوپای بۆدەکات بەسەبەب کە بەرگری لێدەکات و دەڵێ من خۆمی لەسەردائەنێم ونایەڵم کاری وابکەن.

کاتێك موفتی زادەو نزیکەی دووسەد لە یارانی بەنددەکرێن ، دەچێتە لای حکومەت و دەڵێت: ئێوە ئەوانەتان گرتووە ، خەڵکی ئەوانەی تیانەبێت دەبنە کۆمەڵەو ، قەناعەتیان پێدەکات کەبەریان بدەن بەمەرجێك بانگەوازبکەن و دەم نەدەن لەسیاسەت و باسی شیعە، مامۆستا بۆخۆی دیەبێتە کەفیلیان و لەم لاشەوە قەناعەت بەیارانی مامۆستا موفتی زادە دەکات کە فریای کۆمەڵگاکە بکەون تا نەبوونەتە کۆمەڵە ، بەمجۆرە خزمەتێکی گەورەی کردن.

مامۆستا ساڵی ١٩٦٥ ئیجازەی مەلایەتی وەردەگرێت و لە ١٩٦٦ تا ١٩٧٢ لە نەویَ و ئابلاخ لەسلێمانی مەلا دەبێت ، لەسەردانێکیدا بۆ بەغدا لەرێگا کەلا ئەدەن هەندیَ مامۆستای کولیەی دیراسات ئیسلامی بەغدا دەبینێت و داوای لێدەکەن کە ئەمیش داوا پیچشکەش بکات بۆ خوێندن ، بەهەرحالَ وەردەگیرێت و تەنها ئامادەی ئیمتحانەکان دەبێت ، دواتر لە ١٩٧٤ دائەبرێت بەهۆی شۆڕشی کوردەوە ، دوای شۆڕشەکە دەچێتە بەغدا ساڵی ١٩٧٦تا ١٩٧٨ بۆ تەواوکردنی خوێندنەکەی ولە ئیسکان ئیمام و خەتیب دەبێت .

# گەشتی ژیان

کاتێك بەعسیەکان هاتنە سەرحوکم و شێخ عبدالعزیز بەدری یان شەهید کرد ، لەگەڵ چەند کەسێکی تردا وەك نارەزایەك کەچۆن زانای وا دەبێت لەسێداترە بدرێت دەچنە بەغداو چاویان بەهەندێ بەرپرسی بەعسی دەکەوێت ، ئەوانیش ئەمەیان بەلاوە قورس دەبێت و دەیانەوێت بەلآیەکیان بەسەربهێنن ، خوا بەکەرەمی خۆی رزگاریان دەکات.

ساڵی ١٩٧٧ بەعسیەکان داوای لێدەکەن کە باسی سادات بکات کە سەردانی قودسی کردووەو پەیماننامەی ئاشتی مۆرکردووە ، ئەمیش کە باسی دەکات دەڵێت ، هەموو موسڵمانێك ئاواتی ئەوەیە نوێژ لە قودسدا بکات لەبەرئەوەی پیرۆزە ، بەلآم دیارە هەموو خکی ئیسلامیش بەشی خۆیان پیرۆزن و هەرچی تەنازول لە بستێکی بکات تاوانبارە . بەعسیەکان دەزانن مەبەستی (شط العرب) ە کەصدام تەنازولی لەبەشێکی کرد بۆ ئێران تاشۆرشی کوردی هەرەس پێبهێنێت بیە بانگی دەکەن و لێپێچینەوەی لەگەڵ دەکەن.

ساڵی٢٠١٢ سە رۆکی جامعە ی ام درمان لە سودان و وە فدیکی یاوەری دینە کوردستان و لە میانەی زیارەتەکانیاندا سەردانی مرحومی مامۆستا دەکەن بە راستی سەرسامی زانست وادب وفەصاحەتی مامۆستا دەبن دەعوەتی دەکە ن بۆ بە خشینی دکتۆرای فەخری بەجەنابیان . بەڵام مامۆستا داوای لێبوردنی کرد کە بۆی ناکریت..خوا دەرەجاتی

عالی بکات.٢٠١٤/٦/١٣ مامۆستا مەلا محمدی بەرزنجی کۆچی دوایی کرد.

**لەیادەوەریەکانی پرۆفیسۆر ( محسن عبدالحمید )**

لە٢٠١٥/٤/٩ پرۆفیسۆر محسن عبدالحمید وتارێکی بۆ داین لەهەولێر و بەرێزیان وتی:باوکم مەلا عبدالحمید زانایەکی گەورە بوو ئەو زەمانە مووچەی ٣ دیناربوو لەکاتێکدا مامۆستای سەرەتایی مووچەی ١٢ دیناربوو ، کەباوکیشم مرد من تەمەنم ٤ ساڵان بووخانەنشینیان نەداینێ ، تا خێرخوا بۆمان تێکەوتن لە ئەوقافەوە شتێکمان بۆ ببڕنەوە، بەو جۆرە دژایەتی دین دەکرا ، ساڵی ١٩٤٥ نیزام الدین ی کاکم کە لەیەکەم ئوسرەی ئیخوانی بەغدا بوو ، لە سولەیمانی دامەزراو سەردانی شێخ محمدی خاڵمان کرد وخراپ لە بەننا حاڵی بووبوو ، ئێمەش نامیلکەکانی بەنامان بۆ بردکە خوێندیەوە تەواو رای گۆڕا بەرامبەر بەنناو دوای دوو هەفتە کەچووینەوە بۆلای دەستی خستەسەر سەری و وتی: براینە من چیم بەخۆم کرد ستەمم لە ئەولیایەکی خوا کرد، من پەشیمانم خوا لێم خۆش بێت .مامۆستا خاڵ کە ناوی بەننای دەبرد فرمێسك دەزایە چاوی.

لە شەستەکاندا کە تەفسیرەکەی نووسی دەیزانی دکتۆراکەم لە تەفسیردایە وحەزی کرد سەیری بکەم بۆی ،کەسەیرم کرد زانیم ئاگای لە (فی ظلال ) نیە، منیش تەفسیرێکی ( فی ظلال )م بۆ برد بەدیاری.

کە تەفسیرەکەی خوێندەوە وتی: سوودم لێوەرگرتووە بۆ تەفسیرەکەم، من چیم وەڵامی خوا بدایەتەوە کە بیفەرمووایە چۆن تەفسیردەکەیت و (فی ظلال )ت نەخوێندۆتەوە .

مامۆستا خاڵ نامیلکەی (الی الشباب) بەننا ئەدات بە شێخ ئەحمەدی برای بیخوێنێتەوە کە وێنەیەکە بەناش لە بەرگەکەیدابوو، پاش ماوەیەك لە شێخ ئەحمەدی پرسی نامیلکەکە چۆن بوو؟ وتی: هیچی وا نەبوو ! وتی: بێ عەقڵ تەنها وێنەکەی کافیە!!

ساڵی ١٩٧٥ دکتۆرە نەسرین محمد فەخری کەسەرۆك بەشی ئەدەبی کوردی بوو لە کۆلێژی پەروەردەی بەغدا داوای لێکردم کە وانەی تەفسیری کوردی بە قوتابیەکان بڵێم ، کە چوومە پۆلەوە سی قوتابی بوون ، وتم : هاتووم تەفسیرتان پێبڵێم پێکەنینیان ئەهات بەوەزعەکە، پاش هەشت وانە یەکێکیان هەستا وتی: ببوورە مامۆستا رێم ئەدەیت یەك خولەك بەناوی خۆم و قوتابیەکانەوە قسە بکەم ؟وتم: فەرموو کوڕی خۆم.

وتی: ئێمە سەرەتا زۆر بێئەدەب بووین بەرامبەرت ، بەڕاستی بۆمان دەرکەت کە ئەو ئیسلامەی تۆ باسی دەکەیت ئەوەنیە کەئێمە بیستومانە ، بەڕاستی هەندێ مامۆستای نەشارەزا دینیان لەبەرچاوی ئێمە خستووە.

سوپاس بۆخوا تا نیوەی ساڵ زۆربەیان کەوتنە نوێژکردن و ئافرەتەکانیش جلی پۆشتەیان لەبەردەکرد.

**دووسەردەم:**

دکتۆر موحسین دەڵێت: لە پەنجاکاندا کە دەچووم بۆ وتاری هەینی لەمزگەوتی گەورە مامۆستایەکی پیر ئەچووە سەر مینبەرو دەستی ئەلەرزی و بەزمانی عەرەبی وتارێکی کتێبی (ابن نباتە) ی دەخوێندەوە کە چل وتاری تیابوو بۆ هەموو ساڵەکەونوێژخوێنانیش کە زۆربەیان کاسب بوون هیچ تێنەدەگەیشتن و خەویان لێدەکەوت .کەوتارەکان هی پێش زیاتر لە شەش سەدەن (نووسەری ئەم وتارانە ساڵی ١٢٨٧ی زاینی لەدایك بووەو لە قاهیرەو ساڵی ١٣٦٦کۆچی دوایی کردووە) . لەمانگی ١٢ ی ساڵی ٢٠١١ کەچوومە کۆنفرانسی بەرگری لەقورئان سەدان لاوی خوێنگەرمم بینی ئامادەبووبوون ، بیری زەمانی زووم کەوتەوە چاوم پڕبوو لەئاو. هەروەها کەچووم بۆ نوێژی هەینی بۆ مزگەوتی حاجی ئەحمەد لەسولەیمانی زۆردڵم کرایەوە کەئەو هەموو گەنجەم بینی و وتاربێژەکەش بەتواناوشارەزابوو.

**قاعیدە:**

د. موحسین دەڵێت: چەند ساڵێك لەمەوبەر کچەکەم تەلەفونی بۆ کردم کە قاعیدە لەبەغدا بەدوایدا دەگەڕێن ، بۆ ئەوەی بیگرن و بەهۆشیەوە من خۆم تەسلیمیان بکەم بمکوژن ، منیش وتم : زوو بچن بۆ ئەردەن ، ئەوەبوو پاشان لەئەردەنیشەوە زەمانی دکتۆر بەرهەم هاتنە هەولێرو لەزانکۆ مێردەکەی بووە مامۆستا .

# گەشتی ژیان



**واوەیلا بەحاڵی ئادەمی :**

نورسی بەرەحمەت بێت لە مەکتوباتدا دەڵێت :(خەو پەنجەرەیەکە لەسەر غەیب و، جاری وا هەبووە خەوم دیوە بۆ بەیانی وەك رۆژی رووناك هاتۆتە دی) .دیارە مەسەلەی خەو مەسەلەیەکی زۆرگرنگە بەڵام هەموو خەوێك ناو هی هەموو کەسێکیش نا .

یەکێ لەو خەوانەی کە پەندم لێوەرگرت حەزدەکەم ئێوە بیبیستن چونکە ئەوە لەرێی هەمووماندایە : پیاوێکی خواناسی لای کەڵەك کە وتاربێژبوو تا ئێستا سی و چوارجار لەسەر دینداری بەناهەق گیراوەو لەرێی خوادا ئازاردراوە ، شەوێك لەخەویا قیامەت دەبینێ هەروەك چۆن لە قورئان و سوننەتدا باسکراوە ، ئەبینێت کە سیجیلی کردەوەکان ئەدرێت بەدەستی راستی هەندێك و بەدەستی چەپی هەندێکی تر.

سیجیلەکەی ئەمیش دێنن ، دەبینێت هەموو وردودرشتێکی تیاتۆمارکراوە کەئەم هەرگیز حسابی بۆنەکردووە ، بۆنموونە لاپەڕەی درۆکانی پیشان ئەدەن ، کەهەرچی بەمناڵێکی خۆی وتبێ و بەڕاستی نەبوربێت تۆمارکرابوو لەسەری ، هەروەها پیشانی ئەدەنەوە بە صوت و صورە کەرۆژێك لەرێی کەڵەك یەکێ دەستی لێڕادەگرێت و ئەمیش ئیشارەتی بۆ دەکات گوایە بۆ شوێنێکی نزیك دەڕوات کە لەراستیشدا وانیە بۆ ئەوەی هەڵینەگرێت!! لەدڵی خۆیدا دەڵێت : تەواو تازە تیاچووم !

دەنگێك پێی دەڵێت : بێهیوا مەبە سەیری چاکەکانیشت بکە ، کەسەیردەکات بە صوت و صورە پیشانی ئەدەنەوە کە کاتێك بەندکراوە لە ژووری تاکەکەسیداو بەرۆژوو بووە ورۆژی یەك ژەم نانیان داوەتێ و ئەمیش هەڵی گرتووە بۆ ئێوارە ، کابرایەکی یەزیدی دەهێننە لای و ئەمیش کەدەزانێ زۆری برسیە نانەکەی خۆی ئەداتێ و ئێوارە بە ئاو دەیشکێنێ و تاسبەی ئێوارە هیچ نابێت بیخوا ، بەمە دڵی خۆش دەبێت و خەبەری دەبێتەوە ..

ئەمەش تەسدیقی ئەو ئایەتەیە کەدەفەرموێت :هەمووکاروکردەکانی ئادەمی وردو درشتی تۆمارکراون با ئادەمیش لەبیری نەمابن (يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ اللَّهُ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُهُمْ بِمَا عَمِلُوا أَحْصَاهُ اللَّهُ وَنَسُوهُ وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ (٦)المجادلە) .




کتێبی (سەودای سینەیەکی پڕخەم فەتحولاّ گولّەن )م خوێندەوە که مامۆستا جەعفەرگوانی نووسیویەتی ، زۆر دوعای خێرم بۆکرد وزۆر سوودم لەوکتێبە بینی وزۆر کاری تێکردم . داواکارم ئەو کتێبە بخوێننەوە کەبەڕاستی بۆ سەفەری قیامەت زەروورە ..

# گەشتی ژیان

ئەوی سەرنجی راکێشام لەژیانی گوڵەندا خۆ یەکلایی کردنەوەی مامۆستا فەتحولڵایە بۆ خزمەتی دینی خوا ، بەجۆرێك کەلەبەر دەربەدەری و نارەحەتیەکانی رێگا وەك نوورسی مامۆستای ژنی نەهێناو وتی: باکەس بەخۆمەوە گیرەوە نەکەم .لەوەش دەچێت مامۆستا درێژەپێدەرو تەواوکاری مامۆستا نوورسی بێت .

هەروەها بۆ ماوەی شەش ساڵ قاچاخ دەبێت لە حکومەت کە فەرمانی گرتنی دەرچووبوو، لەو شەش ساڵەدا دەرس و دەوری خۆی دەووتەوە جا بۆ ئەوەی نەیگرن ، قوتابیەکانی دەیالخستە ناو قەنەفەی تورکیەوە کەسەرەکەی هەڵدەدرێتەوەو بە پیکاب لەم جیّ ئەیان برد بۆ جێیەکی تر.

هەروەها ئەوەندەی دایکی خۆش دەوێت ، هەرچەند ئێستا لە ئەمەریکایە ،وەسیەتی کردووە کەمرد بیبەنەوە لەتورکیا لەبەر قاچی دایکیا بینێژن. وەرع تادواپلە لەژیانیدا بەدی دەکرێت ، بەتایبەت کاتێك کە لە پەنایەکی مزگەوتدا دەژی کارەبای مزگەوت بەکارناهێنیّ و لەشەودا لەبەر مۆم و چرا دەخوێنێتەوە.

# گەشتی ژیان

ناوەرۆك




پەڕاوەکانی نووسەر:

١-بەرەو پەروەردەی ئیسلامی
٢-بەرچاوڕوونی
٣-فەرهەنگی بانگخوازان
٤-لەخزمەت قورئاندا
٥-بەهاری دڵان
٦-ژیانەوە
٧-نەسرەوتن ٢،١
٨-بەرەو ئیسلام
٩-رازی قورئانی
١٠- رامان لە قورئان
١١ -هەزارویەك
١٢-هەزارو دوو
١٣- سەلیقەی بروادار

چاوەڕێی بەرگی سێیەمی گەشتی ژیان وهەمەرەنگ و کتێبی نەسرەوتن بەشی یەکەم و دووەم بن .

**گەشتی ژیان:**

خوێندنەوە و وردبوونەوە لە ژیاننامەی کەسایەتیەکانی دونیا لە کۆن و نوێدا سوودی زۆری هەیەو،بەهۆیەوە زۆر لە ڕاستیەکانی ژیانمان بۆ دەردەکەوێت.

ئێمە هەموو دەزانین ئەجەل لەلای خوایە،بەڵام کاتێك کەسێك چەند جار ڕووبەڕوی مەرگ دەبێتەوە و نامرێت ئەو کاتە زیاتر لە دڵدا ئەچەسپێت.

ئێمە دەزانین ڕزق لەلای خوایە بەڵام کاتێك دەبینین لە ژیاننامەی کەسێکدا کە چۆن خوا ڕزقی داوە زیاتر بەرچاو ڕۆشن و دڵنیا دەبین

.

ئێمە دەزانین کە ماڵی حەرام بێ بەرەکەتە وسەرەنجام بۆ چاکەکارانە ، بەڵام کاتێك ئەوە لە ژیانی کەسێکدا دەیبینین زیاتر دڵدامەزراو دەبین.

لەم زنجیرەیەدا هەوڵ ئەدەم چەند هەڵوێستێك وپوختەیەك لە ژیانی چەند کەسایەتییەك بخەمە بەردەستی خوێنەران